## لەم ژمارەیەدا




الاشراف الفني : س . ع



سەرنووسەر
اسماعیل رسول
جێگری سەرنووسەر
فائق جمیل

رۆشنبیری نوێ
گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی مانگانەیە
دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات



# بۆچی خومەینی و .. بۆچی شەڕ ؟

**بۆچی شا روخێنراو ... بۆچی لە برێتی ئەویش «خومەینی» دانرا ؟!! .**

دوو پرسیارن بیروباوەڕو پەیڕەوی ئیمپریالیزمی ئەمریکاو موخابەراتی مەرکەزی ئەمریکا ، بەرامبەر بە بەکرێگیراوانی دەخاتە ڕوو .. .. «شا»ش یەکەم کەس نەبوو ... «خومەینی»ش دواکەس نابێ . گوتەی : تاوانکردن لە تێڕوانین لە سووچی کەلانەوە زۆر پلەی هەیە ، هەمان گوتە دەتوانرێ بە تێڕوانینی ئیمپریالیزمەوە بخریتە ئەو شێوازەوە کەوا توانای تاوان لە دابین‌کردنی ئەومەبەسانەی بۆی‌دانراوە ، ئەویش زۆر پلەو بابەتە . بەمانایەکی ترەوە : «روخاندن‌و لەناوبردنی شای کۆن‌و هێنانی شایێکی نوێ ، ناتوانرێ بەهیچ شێوەیەك شی‌بکرێتەوە جگە لەوەنەبێ ئەوا شای نوێ ، بۆ بەدی‌هێنانی ئەو مەبەسانەی پیلانی بۆ کراوە ، بە تواناترە » . کەوابێ ، ئەو مەبەسانەی کە دانراون‌و شا لە تاقیکردنەوەکەیدا کەوت‌و خومەینی پالێوراو تێیدا سەرکەوت چین ؟ .

باسەرنجێکی باری ئێران شا بدەین هەر لە ساڵی ١٩٥٣وە تا کۆتای‌پێ‌هاتنی لە ساڵی ١٩٧٨دا ، چی بۆ بووەو چی لەسەر بووە ؟ .

ئێران ئەشێ ئەلقەیەکی بەبەری جوگرافی بێ کە رەنگە زیاتر لە پردێك لە نێوان یەکێتی سۆڤیەت‌و نیشتمانی عەرەبدا پێك‌بێبنیت ، ئەم ئەلقەیەش دەوری تیژەبناری گێڕاوە ج بەرامبەر بە یەکێتی سۆڤیەت (ئامێری پێشکەوتوو .. مەلبەندی تێڕوانین .. هتد ، لەسەر سنوورەکەی‌دا ) ، یاخود بەرامبەر بە نیشتمانی عەرەب (لایەنی گومان‌لێکراو هەر لە شەستەکانا تا کۆتایی ساڵی ١٩٧٥ ، دەست‌وەردان لە کاروباری ناوخۆی عیراق ، بەبۆنە یا بێ‌بۆنە ، پیلانی ساڵی ١٩٧٠ ، داگیرکردنی دوورگەکانی عەرەبی لە ١٩٧١ دا ، داواکردنی

بەحرێن ، دەوری پۆلیس لە کەنداودا ، یەدەکی هەڵگیراوبۆ قەوارەی زایۆنی ، هەڵوێستەکانی لە (اوبك)و نرخی نەوت ، ... تاد ) .

ئێرانی شا قۆچی قوربانی بەهەڵەداچوونی ئیمپراتۆریەتی کورش‌بوو .. (شا ، بەبۆنەی تێپەڕبوونی ٢٥ بیست‌و پێنج سەدە بەسەر دامەزراندنی ئەم ئیمپراتۆریەتەوە ئاهەنگێکی پیشاندانی مەزنی سازکردبوو ) ، وای لێکرد بۆ پەرەپێدانی هێزە سەربازی‌یەکەی ڕشت‌تر ببێ . وە ولاتە یەکگرتووەکان ئەم ڕشتییەی فارسی بۆ مەبەسەکانی بەکار دەهێنا ، کە یەکەمیان : کارخانەی چەك‌و سەربازی‌یە لەسەر سنووری نیشتمانی عەرەب .

وە دووەمیشیان ، بۆ خۆراكدانی هەستی (متطرف)ی فارسیەت لەلایەن شاوە ، کە وای‌لێکرد زیاتر لە رووی «جەك‌و ئیستخباراتی عەسەری )یەوە پشت بە ئەمریکا ببەستێت .

سێیەمیشیان : نرخی نەوت ، چەکێکی ئەمریکی بوو .. ئەم چەکەش بۆ خزمەتکردنی مەبەسە بۆگەنەکانی خۆی ، خۆی بەکاری دەهێنا .

● ئێرانی شا ، وە لە ئاکامی رق‌و کینەی فارسیەتەوە ، بۆ دامەزراندنی پەیوەندی دبلۆماسی لەگەڵ زایۆنی‌یەوە ، ئابلووقەی ئیسلامەتی لەسەر ئەم قەوارەیەدا بشکێنێت .

ئەم هەموو شتەی کە ئێرانی شا بە ولاتە یەکگرتووەکانی دەدا ، لەگەل مەبەست‌و ویستەکانی ئەمریکاوە گونجاوبەو .. لە پاشان هەرچەند شا دۆستێکی خۆشەویستی ئەمریکا بوو ، کەچی تا دوایی نەبوو .. چونکە ئەمەریکا وای بە پێویست‌زانی کە ئەبێ دەورێکی باشتر بۆ راگرتنی رێبازی گەلان ، بەتایبەتی رێبازی نەتەوەی عەرەب ، بنوێنێ‌و ، ئەبێ وێنەو شێوەی خۆی لە دەرەوەی ئەمریکادا رازاوەتربێ .

« رازاندنەوەی‌شێوەی ئەمریکا لە راگەیاندنی





کارتەرەوە لەمەڕ پاراستنی مافەکانی مرۆڤو !! ، بەهۆڕگریانی لە وتارەکانی دواماوەی سەرۆکایەتیدا هاتووە ، لە ئاکامی – دکتاتۆریەتی دەولەتانی تازە پێگەیشتووو ڕێکخراوە ناوەندیەیە توتالیتا،یەکان –.!!، وە لەقووتدانی مافەکانی مرۆڤو سەرچاوەکانی ، هەروەك دەیویست بە هەلمەتێکی جیهانی بۆ وەستان دژی ئەم باوەڕانەوە هەلبستی ، وە ولاتە یەکگرتووەکانیش کە – سەرچاوەی سەربەستیەتە – سەرکردایەتی ئەم هەلمەتە بکات » !!! .

وەئێرانی «شا»ش لایەنێکی سەرەکیبوو بۆ دابین‌کردنی ئەم خواستەوە ، چونکە ئیتر لە توانای شادا نەماوە پێداویستیەکانی شێوازی نوێی هەڕەشە بردنەسەر ولاتانی تازە پێگەیشتوو بەرێتەسەر . جا ئەو شێوازە نوێیانە چین کە شا بۆ ڕاپەڕاندنیان لەبار نەبوو ؟ .. ئەو شێوازانە لە ئامانجو ستراتیجیەتی «برجنیسکی» سەریان هەلدا کە دەیویست تەنگوجەلەمە دواخراوەکانی کۆمەلگای ولاتانی تازەپێگەیشتوو بێنێتە پێشەوەو هۆی نوێ بۆ بەردەوامبوونی ئاژاوەنانەوە لە جۆرەها شوێن‌و ولاتانی جیهان بدۆزێتەوەو ئەمریکاش بێ‌ماندووبوون بەرهەم بچنێتەوە . وە مەبەستی ئەمریکا لەم پیلانە نوێیەیدا لە نیشتمانی عەرەب‌و لایەنەکانی تری دراوسێ .. بەتایبەتی ئێران ، ئاژاوەنانەوەی مەسەلەی بیروباوەڕی ئایینی بوو ، بۆ ئەوەی زیاتر کێشەو ناکۆکی سەرهەلبداو لە ناوخۆیاندا لەیەکتر هەلگەڕێنەوەو بەگژیەکتردا بچن ... جا شا نەیتوانی ئەم مەبەسانەی ئەمریکا ڕاپەڕێنێت ، بەتایبەتی چونکە بەدرێژایی حوکمیەوە دژی پیاوە ئایینیەکان دەوەستاو ، بەرادەیەك مزگەوتەکان بووبوون بە شوێنی کۆبوونەوەو کارکردن دژی شاوە . هەلبەتە ئەمەش تەگەرەی خستە بەردەم شای ئێران کە «سنووقی باندورا – سنووقی شەڕخوازی » بکاتەوە ، کە ئەمریکا بۆ ئاژاوەنانەوە لە نیشتمانی عەرەبدا هەولی کردنەوەی دەدا .

ئەمریکا ، بۆ ئەوەی بتوانێ ئەم پیلانەی

حێبەجێبکات ، بەشوێن شایەکی تری نوێ گەڕا کە توانێ بەناوی ئیسلامەوە تۆی ناکۆکی بچێنێو باشتر خواستەکانی راپەڕێنێت .

ئەوەش .. ئەمەبوو ، خومەینی بۆ پایەی شای نوێ هەڵبژێردرا .

بەڵێ ... ئەم پیلانەی ئەمریکا ، خومەینی هێنایە سەر تەختی حوکمو وای لە شای ئێرانکرد هرانێ پەنا بۆ کوێ بەرێت .. شای بەهێز زۆر بە ئاسانیەوە ئیمپراتۆریەتەکەی بەجێبهێڵێو خومەینیش، بەبەرەوە ، هێیدی هێدی بێتو شوێنی بگرێتەوە .. ئەم حاڵەتە سەرسامیی بۆ جیهان پەیداکرد .. ئەوەبوو « مەڵبەندی لێکۆڵینەوە ستراتیژیو دەوڵەتان لە لەندەن – لێکۆڵینەوەیەکی بەهاداری بۆ – مارتین کرامر ـی نووسەر بەناوی « ئیسلامی سیاسی »یەوە بڵاوکردەوە .. نووسەر دێتەسەر باسی « شۆڕش لە ئێراندا »و دوپاتی ئەوەدەکات کەوا دیارکردنی ڕێچکەی رووداوەکان لە ئێراندا ، هەڵسەنگاندنو لێتێگەیشتنی زۆر گرانو ئاڵۆزە » . جا پاش ئەم هەموو شتانە ، خومەینی چی لەبارداییە کەوا لە برێتی شای ئێران هەڵببژێردرێت ، سەرەڕای ئەوەی کە شا بەوپەڕی دڵ سۆزییەوە بۆ راپەڕاندنی پیلانو خواستە بۆگەنەکانی ئەمریکا هەردەم دەست بە سینەو ئامادە بوو ... لێرەدا ئەتوانین دەست بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە درێژ بکەین :

● وڵاتە یەکگرتووەکان بەشوێن «شایەکی عەمامەدار » دەگەڕا ... ئەم «شایە عەمامەدار »ەش ئەشێ « خومەینی » بێ چونکە هەر لەکۆنەوە پەیوەندی لەگەڵ ماسۆنیەدا هەیە .

● کۆنەپەرستیو دواکەو توویی بیروباوەڕی خومەینی ، کەوای لێ دەکات لەگەڵ ئەو دەوردی ئەمریکا دەیەوێ بۆ ئاژاوەنانەوەو بەگژیەکدا چووندا بیگێڕێت ، بگونجێ .

● رقیوکینەی «خومەینی» دژی گشت عەرەبو هەر موسڵمانێك پەیوەندی بە عەرەبەوە هەبێ . وەسەرەڕای ئەوەی کە ئایینی ئیسلام لێی دووره ، نکۆلی لە پێغەمبەری مەزن (د.) و پەیامبەرانی ترکرد گوایە نەیانتوانیوە یەکسانیو عەدالەت بەدیبهێننو – ئەو پەیامەکە دەبەرێتە سەرو یەکسانی لەسەر زەمیندا بڵاوە دەکات – !!!! .

رقو کینەی فارسیەت لەلایەن خومەینییەوە گەلێ لەهی شای پێشوو زۆرترو مەزنترە . وە دەست درێژیکردنی و پەلاماردانی بۆ سەر خاکو ئاوی عیراقو هەڵگیرساندنی شەڕو رازی نەبوون بە ئاوبژیکردنو ئاشتی ، بەئاشکرا ئەمە روون دەکاتەوە .

هەڵەیەکی زۆر وورد لە سیناریۆی نوێی ئەمریکا روویدا . هەڵەکەش لەوەدایە کەوا : ئاژاوەنانەوە لە ئێرانا ، هەر لەکاتی لەناوچوونی شاو هاتنی خومەینی بۆ حوکم پێویستە . ئەمەش بۆ ئەوەی دەرحاڵ ، خومەینی ، خۆی بەتەنیاوە جڵەوی حوکم بگرێتە دەنگی بەرەی نیشتمانیو ئازادیخوازو نەتەوە غەیرە فارسەکان کپ بکاتەوە .

بەڵام خێراکردن بۆ پەلامارداندو دەست درێژیکردنە سەر عیراق دۆخێکی بە پێچەوانەی گشت دانانو بۆچوونەکانی خولقاند .

لەکاتێکا خومەینی ریستیوای دەرست گوایە هەر سەرکەوتنێك بەسەر گەلوسوپای عیراق – کەلای زۆر ئاسان بووە کرەوی لەسەر بەرەی ناوخۆیشمانی دەکرد – !! ، پایەوشوێنو وەسیەتەکانی بەهێز دەکاتو تەنیا خۆی ئەبێتە ( شا )ی مەیدان .. کەچی ئەم هەموو بۆچوونو حیساباتەی لێبزربوو .. لەوکاتەی کە نەیتوانی خۆی لەبەردەم گەلو سوپای نەبەزی عیراق بگرێو بشکێو لە بەرەیەکدا کە پانایی زیاتر لە هەزار کیلۆمەتر دەبێ ببەزێو خۆی ـ تاقمەکەی بەسەرشۆڕییەوە هەڵگەڕێنەوە . سوپای عیراق کە پانزە مانگی بەسەر برد ، بەردەوامە لە پاراستنی گیانی سەرکەوتنو وەدیهێنانی سەرکەوتنی زیاتر ..... ئامادەیە ، هەروەك بڵێی لەیەکەم رۆژی شەڕایە ، کە زیاتر خوێنی گەرمو پاكو بەنرخی خۆی لەپێناو شەرەفی خاكو نیشتماندا ببەخشێت تا ئەو رۆژەی دەستەو تاقمی خومەینی رووڕەش چۆكدادەنێنو دان بەمافە رەواکانی عیراق دەنێن . سەرکەوتنی عیراق بەسەر ئێراندا نەك تەنیا ئاژاوەی نایەوە ناو ئێرانو بەس . بەڵکو ئەو حساباتەشی شێواند کە بۆ رژێمەکە دانرابوو بۆ ئەوەی بە ووردییەوە رایپەڕێنێت .

ئەو شەڕەی کە خومەینیو تاقمەکەی دایانگیرساند ، زۆرشت روون دەکاتەوە .. بەتایبەتی سەبارەت بە پەیوەندیی بەتینی لەگەڵ قەوارەی زایۆنیزم . کە شەڕەکەشی پەردەیەك بوو بۆ دەستوەشاندنی زایۆنیزم لە دامودەزگا ئەتۆمییەکانمان .. وە بەشێوەیەکی راستەوخۆش بەشداری پێداتێپەڕاندنی پیلانی ئەمریکاو زایۆنی بەنیشتمانی عەرەبیدا کرد . جارێکیتر وێنەوشێوە روون دەبێتەوەو گەلای کویەك دوای یەك دەکەوێتو هیچ نامێنێ جگەلەوەنەبێ کە ئەنجامی تاقیکردنەوەی نوێ ئەمریکا لەم شەڕەدا رابگەیەنێت ...

ئایە «شای عەمامەدار » بمێنێ یان بەشوێن شایەکی تری نوێ دەگەڕێ .. یان چیتر ؟ نزیك چ دوور ، ئاشکرای دەکات .

# پاشەڕۆژ..!

**ئێرانی ئەمڕۆو لەم مێژووەی هاوچەرخانـــەی خۆیدا ، لە بەردەم دووڕیانێکی یەجگار گرینگ‌و بنەبڕ وەستاوەو وانیە تەنیا هەریەک تاقە پاشە ڕۆژی هەبێ، بەلکو لەبەردەم دووجۆرە پاشەڕۆژ دایە .. پاشەڕۆژی ئێستای ڕژێم‌و پاشە ڕۆژی هێزی موعارەزە .**

گەر کارەکە واکەوتبێتەوە ، ئەبێ چ جـــۆرە پـەشەڕۆژێ چاوەنۆڕی ئێران بێت ؟ ئائەمەیە پرسـیارە هەرە گرینگەکە .. هەر ئەم پرسیارەیشە کە لـەبەر ڕۆشنایی چەندین بەخشش‌و گۆڕانێکـــی وادا ، سەرباری ئەو ئالۆزی‌یە دیارەی نێوان ڕژێم‌و کۆمەڵ‌و پێوەندیەکانی ئێرانی ئەمـڕۆ ، بۆتـــە ، مایـــەی ڕەسیدەبوونی لێکۆلینەوەیەکی پەسەندو لەبار .

لەوانەیە بەئاسانی بتوانین بڵێین : کە ڕژێمـی ئەمڕۆی ئێران ، هەر ڕۆئەچێت‌و دائەڕمێ .

واتە : ئەم ڕژێمە بەردەوامبوونـی بۆ نیـــەو نەماوە ، ئەم قسەیەش زۆر لەڕاستی‌یەوە نزیکە .. بەڵام پرسیاری ڕاستەوڕاست ئەوەیە : کە بۆچـــی ئەبێ ئەم ڕژێمە هەر ڕۆبچێت‌و بڕوخێ .. ؟

حوکمدان بەسەر پاشەڕۆژی هـەر ڕژیمێـک لەجیهاندا ، هەروا بەسانایی‌و بەهەواوهەوەســی هێزەکانی دژ بەم ڕژێمە یا ئەو ڕژێمە مەیسەر نابێت . چونکە مەسەلەکە زۆر لەمە گرینگترەو لەوانەیە گەلێ هۆی جۆی‌جۆی ببێتە مایەی ئەوەی ئەو ڕژێمــە تەمەن درێژ بێت ، یا تەمەن کورت بێت‌و ڕووبـەڕووی هەلدێری دارمانی بکاتەوە .

لەسەر ئەم بنەڕەتە ئـەتوانیـن بەدڵنیـایی‌و لەئەنجامی زانینی نەخشەی سیاسـی‌و لەشـکری‌و کۆمەڵایەتی‌و لایەنی جیاجیای ناکۆکیەکانی ئەمـڕۆی ئێران بڵێین : کە ڕژێمی ئێران لەڕادەبەدەر درێـژەی کێشا .

واتە : حاڵی حازر هەمو جۆرە هۆیەکی دارمان‌و لەناوچوون پێگەیوەو هەیە ؛ کەچی ڕژێمەکـــە هەرماوە .. ئەمەیش ڕاستیەکی ئاشکرایە ، بـــەڵام ئەو ڕاستی‌یە هەر ڕواڵەتەو بەس ، چونکە ڕژێمەکـــە چەند مانگێ ئەبێ ، بەشێوەیەکـی پراکتیکیانـــە ، کەوتوە ..

هەروا ئەتوانین بەدڵنیایی‌یەوە بڵێین : کـــە جەنگی نێوان عێراق‌و ئێران ، دەورێکی بنەڕەتـــی‌و گەورەی لەتاوسەندنی ڕۆژی مەرگ‌و دارمانی ئـــەو ڕژێمەدا گێڕاوە ، ئەمیش چونکە :

١ – تائێستا بەهیچ کلۆجێ نەیتوانیوە بەرنامەیەکی شۆڕشگێڕانەی دژ بەبنچینەو پێوەندیو ناسنامەکانی کۆنە ڕژێمی حەمەڕەزاشا بێنێتە دی .

٢ – تێک شکانێکی سامناکی سوپایی ئەم ڕژێمە ، لەسەرانسەری سنوورەکانی لەگەڵ وڵاتێکی دراوسی‌دا ( عیراق ) .

٣ – لەدژوەستانێکی فراوان‌و چالاک‌و چەکدارانەی نێو دامودەزگاو هەر شوێنێکـــی ئەو ڕژێمــە ، بەچەشنێ کار گەیشتە دیارترین کەس‌و سەرکردایەتـی ئەو ڕژێمە .

٤ – لاتەزایەکی گەورەی ڕژێمەکـــە لەنێـو دەولەتانا ، کە هیچ دەولەتێ لەم ڕۆژگــارەمانــدا نەیبینیوە .

٥ – دارمانێکی فراوانـــی باری ئابـــووری‌و لەبالیەکدەرچوونێکی ڕوخێنەری کۆمەلایـــەتـــی‌و نەتەوەیی .

٦ – ئێرانی ئەمڕۆ ، لەژێر سایەی ئەو ڕژێمەدا ، دەولەتێکە ، قابیلی دابەشبوون‌و داپچڕانە .

جاگەر ئەمانە ، نیشانەیـــەک بن ، بـــۆ پاشەڕۆژی ڕژێمی خومەینی ، ئەی – کەواتە – ئەبێ پاشەڕۆژی ئەو جێگرەی جێی ئەو ڕژێمـــە ئەگرێتەوە چی بێت ؟

واتە : پاشەڕۆژی هێزی موعارەزەی چەکدار ، کە ڕۆژ دوای ڕۆژو سەرباری هەمـــو چەشـــنە دەسوەشاندنێکی دڕندانەی ڕژێم ، کە چالاکیەکانی ئاشتیانەو چەکدارانەی پتر تاوئەسێنێ ، چۆن دێتـە بەرچاو .. ؟

بێگومان موعارەزەی چەکدارانـــەی ئێران ، سەرباری ئەو هەمو دەسوەشانـدنە قورســـەی ڕژێمەکەیش ، توانیوێتی دەستی پۆلایین بوەشێنێتە دەزگاو کەسانی ئەو ڕژێمەو ئاشـوبێکـــی زۆرو ترسێکی جگەربڕ بخاتە نێو ریزەکانی ئەو ڕژێمە .. کە ئەمیش :

خـۆی لەخـــۆیدا ، هەنگاوێکی بنجی‌یـــە ، لەهەلـوڕاندنی ململانێی چارەنوسانەی نێـــوان ڕژێم‌و موعارەزەو کە لەئەنجامیشا ئەبێتە مایـــەی سەرکەوتنی یەکجارەکی موعارەزە .. بەڵام هەرتەنیـا ئەم هەنگاوە نابێتە مایەی یەکلابوونی یەکجارەکـــی ئەو ململانێیە ..

بۆیەکە ، بەرفراوانکردنی بنکەی میللیانەی موعارەزەی ئێرانی ، دەورێکی بنەڕەتیو پێویست ئەبینێ ، لەقوولکردنی ئەو دژوەستانو بەرەنگاربوونەی رژێمی ئەمڕۆی ئێرانو لەهەمان کاتیشا ئەبێتە مایەی وریاکردنەوەی ئەو کۆمەڵە خەڵکانەی کە بەدروشمەکانی رژێم هەڵخەڵەتاون ، یا هەر هیچ نەبێ ، ئەو کۆمەڵەخەڵکانە لەم ململانێیەی نێوان خۆی ورژێمەکە ، بێلایەن بکات .

بەم پێیەوە ، ئەبێ موعارەزەی ئێرانی تاوی شەپۆلی لایەنگرانێ رژێمەکە بشکێنێ ، جا چ ئەوانەی قەناعەتێکی مەبدەئیانەی راستەوە ، یا لەئەنجامی [illegible]پەرستیو بەرژەوەندخوازییەوە لایەنگیری ئەو رژێمە ئەکەن . چونکە لەبەرژەوەندی موعارەزەی ئێرانی دا نیە ، چ ئەمڕۆو [illegible]بەی ، رەگی پێوەندیەکانی خۆی لەگەڵ ئەو لایەنگرانەدا ببڕێت ، تاکو نەبن بەکۆسپو نەچنە شوێنی خۆپاراستنێکی کوشندانە لەخۆیان .

مەسەلەیەکی تر هەیە، خۆی لەبەردەم موعارەزەی ئێرانیدا قوت ئەکاتەوە ، ئەمیش : جۆری ئەو دەستاوێژانەیە کە لەدژی رژێمەکەو لەپێناوی روخاندنیدا بەکاردێت .

واتە : مەرج نیە تەنیا شێوازی چەکدارانەو کوشتنی کەسانی رژێمەکە ، بەتاکەشێوازێکی سەرکەوتووی لەبار بزانرێت ، بۆ لەناوبردنی رژێمەکەو بەس .

راستە ، ئەم جۆرە شێوازە ، شێوازێکی کاریگەرەو کار لەکۆلەگەو دامودەزگای رژێمو کۆمەڵ ئەکات ، بەڵام هەرتەنیا پێڕەوکردنی ئەم شێوازە ، ئەبێتە مایەی ئەوەی موعارەزەی ئێرانی ، خەڵکێکی زۆر لەدەسبدات ..

هەروا نابێ شێوازی چەکدارانە ، نرخو بایەخ بۆ دەوری گرینگو گەورەی شێوازەکانی ئاشتیانەو کۆمەڵایەتیانەدا نەنێت ، نابەڵکو ئەبێ سوود لەموعارەزەی قانوونی نێوان شوێنو لایەنەکانی رژێمەکە خۆی وەرگرێت ، تاکو لایەنگرەکانی لێ بتەکێنێتو دووریان بخاتەوە . لەهەمان کاتیشا ئەبێ پێڕەوی بەرنامەیەکی دیاری سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیانەی وا بکرێت ، تا پێداویستیەکانی کۆمەڵگەی ئێرانی بگرێتە هەمێز ، بەمەیش : ئەتوانێ کۆمەڵێکی فراوانو کاریگەری نێو کۆمەڵ بۆ

خۆی راکێشێت‌و بیکا بەگژ رژێمەکە .

ئێمە لێرەدا نامانەوێ ، چەند پەندو دەرسێك بخەنیە بەرچاوو دڵی موعارەزەی ئێرانی ، تا پێڕەوی دەستاوێژو راووتەگبیرو دانانی بەرنامەی پێ فێر بکەین ، چونکە ئەمەیان مەسئولیەتی موعارزەەی ئێران خۆیەتی‌و هەرئەمیش باشتر لەهێزو تواناو لەپێداویستیەکانی کۆمەڵگەی ئێرانی‌و لەخواست‌و ئارەزووی رۆڵەکانی ئێران تێ‌ئەگات .

سەرباری ئەم رابینینە پێویستەیش : ئێمە لەو بڕوایەداین کە : بایەخدان بەم مەسەلانەی کە باسمان کردن ، هەلی باش‌و لەبار ئەخاتە بەردەم موعارەزەی ئێرانی‌و کات‌و رێگەو قوربانی‌ی بۆ کەمتر ئەکات‌و زووتریش کۆتایی بەو رژێمە ستەمکارە ئەهێنێ .

رژێمی ئەمڕۆی ئێران ، چارەنووسی خۆی خستۆتە بەر هەڵدێرێکی هەزار بەهەزارو هەموو هەوڵ‌و تەقەلایەکی نائومیدانەیشی ، بۆ لێدانی موعارەزەی ئێرانی‌و کوشتن‌و بڕین‌و پەتی سێدارەو خنکاندن ، ناتوانێ لەم‌چارەنووسە رەشەی دورەپەرێزی بکات‌و هەمو شتێکیش پەنجەنمای ئەوە ئەکەن کە : ئەم رژێمە لەلێدان‌و تۆقاندن‌و کوشتن‌و کوت‌و سێدارەی دڕندانەی خۆی لە دژی‌موعارەزەو هەر لایەنێکی کەیش ، کە گومانی لێ‌بکات ، درێژە پێ‌ئەدات‌و لەم قۆناغە ناسکەیش‌دا ، موعارەزەی چەکدار قوربانیەکی زۆر ئەبەخشێت‌و هەوڵیش ئەدا ، هەندێ شێوازی تازەو لەبارتر بدۆزێتەوە ، بێ دەس لەچەك بەردان ، کە بەجارێ ریزەکانی رژێمەکەی شلۆقاندو شان‌و شەوکەتی ، لەبەرچاوی گەلانی ئێران‌و سەرانسەری جیهاندا شکاند .. تا رۆژی ئەمڕۆیش هێشتا دەسپێشکەری هەر لەدەس موعارەزەی ئێرانی دایەو رۆژ دوای رۆژیش کۆمەڵانی خەڵکی ئێران لەدەوریا کۆئەنیەوەو پەتیاپەتیایش لە رژێمی بۆگەن ئەتەکێنەوە ...

رۆژی ئەمڕۆ رژێمی ئێرانی ، بەشەلەشەل هەنگاو بەرەو هەڵدێری دارمانەوە ئەنێت ، لەهەمان‌کاتیشا پاشەرۆژی ئێران ئەکەوێتە دەس هێزەکانی موعارەزەی ئێرانی ، نیازخوازین ئەو پاشەرۆژەیشی ببێتە مایەی خێروخۆشی‌و هەدادان‌و ئاشتی‌و داساکان ، لەنێو ئێرانێکی وادا کە هەمو چەشنە رواڵەتێکی دوژمنکارانەو پێ‌راکێشانێکی ناهەموارو رق‌وکینەو کاری خوێناویانە ، بنەبڕ بکات .

# ڕۆژنەیەك و هونەری وەرگێڕان

هونەری وەرگێڕان جاری پێزەوگەیەو پێنجگە لەچەند هە
گشتی . بە کورتی شتێکی ئەوتۆی دەربارە نەنووسراو
هیچ نەبێ ل لێ باسەدا بەوەندە ئاشنادەبین کە کاروانی حەلکی
جۆن ئەکانی دەر ، ئێمەش هەر پیادەبین . . ! !
وەرگێڕان بووەتە بێ وەختییەکی ژیان . . لەگەڵ ئەوەشدا کە
سپاردەیە . تووشی گرێکاری دەبێ و ئەو گەرموگوڕییەی کە لە
داناڵدا هەیە . لەمدا بەدەست نایە . بۆیە گوتویانە :
«وەرگێڕان وەك ماچ کردنی نازدارێکە . . بەلام لەپشت
شووشەی پەنجەرەوە . . ! !» . (١)
«دەشێ ئەوەی بەلای گەلێکەوە پەسندبێ ، بەلای
گەلێکی دیکەوە دزێو بێ .» (٢)
دەستەموو لە زمانێکەوە بۆ زمانێك مێرشکاری خۆی
دەوێ . بۆیە لە بەیدەست کردندا . کورد وتویە :
«کەروێشکی کوێستانی بە تاژیی گەرمێنی
راوناکرێ . . !!» .

لێکۆڵینەوەی : ڕەئووف ئەحمەد ئالالانی

**وەرگێڕان دێرینە ڕووداویکە** :-سی‌وپێنج سەدە لەمەوبەر
زمانی هاوبەشی دەوڵەتان سەری‌هەڵداوە . نزیکەی شەش سەد
تاتە قوری حوورەوەکراو لە میسردا دۆزرانەوە . . بە خەتی
مێخی‌و بەیەك شێوەزمان بوون .

هەمان نموونەخشت لە دوورگەکانی یۆنانو دوڵی دجلەو
فوراتدا هەبوون . . سەرچاوەی زمانەهاوبەشەکە
هەرکامێکیان‌بێ لەو دەوڵەتە دراوسێیانە . وەك زمانێکی
دیبلۆماسی لەسەری پێك‌هاتون . لە پەیامگۆڕیدا . دەشێ هەر
دەوڵەتەو چەند تەرجومانێکی بۆ تەرخان‌کردبێ[٣]

پێویستبوون بەوەرگێڕانو زوو لەیەکدی‌گەیشتن
گەیەرادەیەك لەم سەردەمەدا – مەکینەی تەرجەمەیان
داهێناو زانا ڕووسەکان لەم تاقی‌کردنەوەیەدا
دەست‌پێشکەرییان‌کرد . کە دەوڵەتی رۆما حکۆی ئاوابوو زمانی
لاتینیش دایەکزی . زمانی دەست‌کرد وەك (اسپرانتۆ) لەگەڵ
پشتگیرشیدا زۆری بە بەرەوەیەو دوورە کە ببێتە زمانی تەرجومانی
جیهانی . مەبەستم هۆی سەرنەگرتنەکەیەتی کە ئەمەیە :

« زمانێك کە گەلو مێژووی گەلێك‌و ئاداب‌و نەریتی میللی بە
پشتەوە نەبێ . لاشەیەکی بێ‌گیانە . .زمان زیندەیەکەو بە هێمنی
لەگەڵ ڕەوتی ژیانی گەلەکەیدا مل‌دەنێ‌و بە درێژایی ڕۆژگار
چارەنووسەکەی دەبەستێتەوە بە خودی گەلەکەی خۆیەوە»

ڕێبازەکانی وەرگێڕان ، بەکورتی :

١ وشە بەوشەو بەبێ پاش‌وپێش . .
٢ – دەقاودەق لەگەڵ هەندێ پاش‌وپێش . .
٣ - بەلێ‌زیادکردنو لێ‌کەم‌کردنەوە . .
٤ – پوختەلێ‌وەرگرتن :- وەرگێڕان بەئیلهامەوە .

گواستنەوەی وشەبەوشە کارێکی سەختە بەتایبەتی لە نێوان
دووخێڵە زمانی دوورە نەژاددا . وەرگێری ئەم لایەنە یێ
بلیمەت‌و بەهرەمەند نەبێ . تێیدا سەرناکەوێ .

– وەرگێڕان بەزیادو کەمیەوە :

بەنموونە یەکێکی وەك دکتۆر تاها حوسەین ، پەسندی
نەکردوە . بەلای ئەوەوە کە دەقاودەق نەبێ لە تەوەری
وەرگێڕان دەترازێ .

زیادوکەمی پتر تووشی ئەو بەرهەمانە دەبێ ، کە بۆ دووەم
جارو سێیەم جار لەم زمانەوە بۆ ئەو زمان ڕاماڵ‌دەکرێن

ئەمەش بارێکی ناچاریە بەچاو هەموو زمانێکەوە . . .

هەندێ زمانی خەملاّو کە لە قۆناغی ئارامدا چەق خۆی گرتوە ، ئەوەندە بەرەنگاری ئەم دەردەنابێ ، زمانێکی وەك کوردیی ئارام‌نەگرتو وای بۆ رەخساوە ، کە زۆرینەی بەرهەمە دەرەکیەکانی هەندەران ، بە پردی زمانی گەلە دراوسێکانی - دا ، راگوێز بکا ، ئنجا ئەوانیش راستەوخۆ لە ئەسڵە دەرکیەکەوە وەریانگێرابێ یان بە ناراستەوخۆو دوای دەست‌تێوەردانی بە زمانێك یان دوابەدوای چەند زمانێك ، گواستبێتیانەوە .

بەنموونە لە کوردستانی عێراقدا ، زمانی عەرەبی سەرچاوەی زانست و رۆشنبیری و ئاینیانە ، زۆرینەی بەرهەمە دەرەکیەکانیش لەو رێگەیەوە دەکەینە کوردی . . لەگەڵ ئەوەشدا کە هاوخێڵ نین .

لێرەدا بیرەوەرییەکی باوکم دەگێرمەوە : «نەوەد ساڵێك لەمەوبەر کە دەستە فەقێیەك دەبێ و دەکەوێتە نێو هۆبە جافێکەوە :

لە کۆری سەرخێڵدا ، شووتییەك دەهێننە بەرەوەو سەرخێڵ لێی تەسەل دەبێ ، ئنجا حەواڵەی بەردەمی پیاو خاسەکانی دەکاو دەڵێ : ئادەی ئێوەش «کرنی دەن» . . .

ئەوانیش لەوسی پێدادەهێنن و دەیخەنە بەردەمی شوانەو ێڵەکان و پێیان دەڵێن : ئادەی ئێوەش - کرناوکرنی بدەن - ! ! »

تەرجەمەی تەرجەمەکراویش وەك یارۆ شووتی - لە جاری دووەم و سییەمدا - تام و رەنگی بە بەرەوە نامێنێ !

جاری واهەیە کە - لێ‌لابردنەکە - هەرچەندە گزیە ، باری ناچاریە ، وەك هۆی ئاینی . . . تەشەر . . . کەمایەسی نەتەوە . . پێ‌ڕانەهاتن و شەرم . . . مەترسی و کەم‌دەرفەتی . .

جۆرە وەرگێردراوەکان :

١ - زانستیە رووتەکان

٢ - زانسیتە کۆمەڵایەتیەکان . .

بەفەلسەفەو قانونونەوە . . .

٣ - بەرهەمە ئەدەبیەکان .

وەرگێران بە نووسین سێ‌جۆری بۆ دەست‌نیشان کراوە :-

أ - بۆ راپەراندنی کاری رۆژانەو بەخێرایی وەك رۆژنامەنووسی . . بازرگانی . . .

لێرەدا وەرگێرەکە فرە ماندوو نابێ و ئامێرانە کارەکەی رادەپەرێنێ و دواناکەوێ . ئەم جۆرەیان کارێکی راگوزارانەیە .

ب - پەیامکاری و بەڵێننامەی نێو سەرانی دەوڵەتان . ئەمەشیان لە تەرزی نێونجیەو لە بواری وەرگێرانی دەقاودەق‌دایە .

جـ - جۆری سێیەمیان ، بەندە بە شتی چەسپاوەوە ، بەدرێژایی رۆژگار خۆی دادەکوتێ . تابلێی سرك و ناسکە ، پێ‌ویستی بە هێمنی و ماندوێتی و بیرتیژی هەیە ، چونکە بەشێکە لە بابەتە ژیریەکان . . . ئەو زەخیرەیەیە کە رۆشنبیریی لێ‌پێك‌دێ . . . نەوە لە دوای نەوە دەبنە میراتگری .

لە دوو روانگەوە سەیری بەرهەم و زادەژیریەکان دەکرێ : ماددەی کتێبەکەو ریبازی بەیان و شێواز . . . لەسەر ئەم بناغەیە بەرهەمە ژیریەکان دەکرێن بە سێ بەشەوە :

١ - گرنگیی ماددەکە بە پلەی یەکەم و شێوازیش بە پلەی دووەم . زانستە سروشتیەکان و بیرکاری لەم بەشەیەن .

٢ - دیسانەوە ماددەکە سەرەکیەو دارشتنەکەشی ، پێ‌ویستە ئەوەندە بەچێژبێ کە خوێنەرەوەکە بە تاسەوە خووی بداتێ . . زانستە کۆمەڵایەتیەکان و فەلسەفەو یاساگەری . لەم بابەتەیانن .

٣ - جۆرێکی دیکەمان هەیە کە زادەی ئەندێشەو داهێنانی بەسەردا زاڵەو بریتیە لە بەرهەمە ئەدەبیەکان . . . بە شیعرو پەخشان و چیرۆکەوە ئەمانە داوای شێوازو دەربرینی جوان و کاریگەر دەکەن . . لەم سۆزگەردانیەدا ، بارلێ‌گۆرینی هونەری لەپلەی یەکەم‌دایە ، هەر بەم سەبارەتەوە کاتێ خۆی - ئەدەب - بە لقێك لە هونەرەجوانەکان حەلێب‌کراوە .

بەرهەمی ئەدەبی . شایستەی ئەدیبە کە وەری‌بگێری . ئەگەر بەو هونەرە باری دەروونیی کاریگەر نەبووبێ . زۆر نابەجێیە خۆی لە قەرەبدا . وەك دەڵێن : هەموو کەسێك و خوێنەرەوەیەك چێژو ئارەزۆی ئەدەبی هەیە بەلاّم بەرهەم‌هێنان شتێکەو تام‌لێوەرگرتن شتێکی دیکەیە . . . گشت کەس تامەزرۆی خۆراکە ماددەی باشە . مەرجیش‌نیە هەمووکەسێ بتوانێ خواردنی ناياب و بەتام سازبکا .

گوتمان : (بارلێ‌گۆرین و پاراوی سەرەك‌مەرجن لە ئەدەب وەرگێراندا ) ئەم گفتە پەندەئیتالیەکەمان دەخاتەوەیاد کە

(وەرگێران بێبەش نابێ لەگزیو دەستتێوەردان) . ئەمە راستە ، بەڵام با – گزیکاریەکە ، زۆرنەبێ . . . دەنا کەس ناتوانێ سپاردەکە وەك خۆی بپارێزێ ، دەشتوانێ لایەنی زۆری نەشەمزێنیو بێبەرامەی نەکا .

ڕێگەش لە وەرگێرانی دەقاودەق نەگیراوە ، پەیامبەری ئەم کارە ، بە هەڵکەوتو پەنجەنما دەکرێ ، سەیرلەوەدایە کە نابەڵەدەکانیش کەیفیان لەوەرگێرانی وشەبەوشەیە ، کاری ئەمانە لەبەر لێهاتوییو سپاردەپاراستن نیە بەڵکو لەبەر بێدەسەلاتیەو برشتی چوونەناخیان نیەو ئەوەی لە جێ پەرێزیاندابەجێدەمێنێ چەند گوڵە گەنمێکی سنخواردویە . . ! !

پاراستنی گیانی دەربرینە ئەسڵەکە ، سەرەکیە ، ئەوەندە قەڵەمکاربێ کە بزانێ :

لە کوێدا توورەبوون ئاگردەدا . . . لە کوێدا باری هێمنی دەگرێ . . . لە کوێدا ئەوەندە سۆزی دەداتێ کە جواناوو مەرەکەب تێکەڵاو دەبن . . . لە کوێدا دەیکاتە گەمەو داشۆرینو . . . هتد ئەم تابلۆیانەی بەندن بە شێوازو کەرەسەو دەربرینی تایبەتیەوە . . بە هەمەحاڵ پاراستنی هەستەدەروونیی خاوەن ئەسڵەکە ، گیروگرفتێکەو لە گۆڕێدایە ! !

مەرجە گشیەکانی وەرگێر :

١ – توانای زمانی

٢ – توانای شیکردنەوە

٣ – توانای نووسینیو دارشتنو گونجاندن .

٤ – توانای تێگەیشتنو تێگەیاندن . . بە شێوازی رەوانو گواستنەوەی تەواوەوە . بۆ هەریەکێك لەو چوار بنکەیە نیمچە بەحسێکی دەویو لێرەدا بوارەماننیە .

وەرگێران کارێکی ئاساننیە ، هەندێ لەو باوەرەدان کە وەرگێران لە دانان گرنترە ، چونکە لەویاندا نووسەر چەندە خۆیراتەکێنێ بەئەسڵەکەوە دەبەسترێتەوە ، دیلی واتاوبیری ئەو بەرهەمەیە کە دەیەوێ بیگوێزێتەوە . . کەچی لە داناندا چۆنی لێوردبیبێتەوەو باریلێبگۆڕێ ئازادو سەرفرازە .

لە وەرگێراندا دەستەمۆکردنی واتای سرکو زاراوەی نامۆ لە هەردوزمانەکەداو بەرابەریان بەیەکدی ، پێوەخەریك بوونی باشی دەوێ ؛ هەڵکەندنی واتاو مەبەستی سەربە زمانی بێگانە ، لەلانەی سەختدایەو هەر وەها بەئاسانی بەیدەستنابێ .

## وەرگێران لەپێناوی چیدا . . ؟

لەسەرڕۆیشتنی ئەم خاڵە بەندە بە شیکردنەوەی بارو دۆخی گۆمەڵگاو راپەرینی گەلەوە ، هەرچەندە ئەمرۆش زاردەی دوێنێیە کەچی هەندێ شت کە لە پێشیندا باوبووە بەکەڵکی ئێستانایەو پێویستی بەکوتانەوە نیە . . برێ ئاڵوگۆڕی ئێستاش مۆرکی بازدانیان پێوەدیارەو لە دواخۆیانەوە بۆشاییەکیان بەجێهێشتوە . . . هەیشە تازەبابەتی هەندەرانەو ئێقکردنەوەی پاش تەسەلبوونیانە . . . ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە دەیانکەینەوە بە بەرکوڵ . . ! !

هەرچۆنێکی لێبلێین ئەم کارەمەزنە بەبێ پلانو خواستی سەردەم ، دەبێتە گەرداوێكو ئەوسەری دیارنەبێ؟! . . .

هەر لە دراسێکانمانەوە تێبروانینو بپرسین :

لەسەرەتاوە چیپاڵی بە عەرەبەکانەوە نا ، کە خووبدەنە وەرگێران . .؟ .

زاناعەرەبەکان دەڵێن : لە دوادوای دوڵەتی عەباسیدا زۆر لە جوولەکەو گاورەکان– لە داخی سەرانە – لەریزی ئیسلامەکان هەڵخزان . . ئەوانیش فەلسەفەی ئیغریقیو رۆشنبیریی فارسییان باش دەزانی . . . لەو خوێندەوارانەوە دەمەقاڵیو کێشەی «قدرة . . . ، اختیار حَیز ، جەوهەر ، جزء لا یتجزأ ، دور ، تسلسل . ئادابو مناظرة . . . هتد ، ئاوێتەی دەستوورەکانی ئیسلامبوون ، ناچار زانامسڵمانە عەرەبەکان تێوەگلانو بۆ بەرگریی شۆرشەکەیان ، پێویستیان بەو چەکەبوو کە ئەوانی دیکە بەکاریاندەهێنا . . . ئیدی کەوتنە وەرگێرانی بابەتە فەلسەفیو ژیربێژیەکانو لەمەوە چەندان رێبازو مەزهەب کەوتەوە ، دواتر خوودانە وردەکاریی بیرتاك وژیربێژ بووە مایەی چەشە ژیری (لذة عقلیة) کارەکە تەشەنەی کردو خەلیفەکانیش دەنەی تەرجومانەکانیان دەدانو بە پاداشیدانەوە تێژیاندەکردن[٤]

بێجگە لەوەش زانستو فەلسەفە زادەی ژیرینو جیهانینو مۆرکی نەتەوایەتییان لێنادرێ ، بە پێچەوانەوە ئەدەب ، زمانی سۆزو پەرۆشی نەتەوایەتیە ، هەرگەلەو دەزگای خۆی هەیە . زمانی سۆزیش مەنتیقێکی دابینکەری نیە .

ئێستاش ئاسۆی زانستو ئەدەب بە تەواوی رەویوەتەوە ، کاروانی ئەم پەراوپەری جیهان لەنیگاو بروسکەیەکدا بەیەکدی دەگەنەوە ، ئەمەش لە پێناوی تێگەیشتنێکی باڵای مرۆڤانەدا ،

کەواتە بە خوایشت‌و ناخوایشت ئەدەبە خۆمالی‌و میراتە نەتەوایەتیەکانیش بە تەوژمی کۆچ‌ورەوی دەرکیەکان، جەنجال‌دەبن، کەواتە تووشی راگوێزی چاك‌و خراپ دەبین، لایەنە هەموارەکان دەکەینە خۆراکەماددەی زادەنەتەوایەتیەکانمان‌و ناهەموارەکانیش پەرچ‌دەدەینەوە کە نەبنە مایەگەمە بە بیرەوەری‌ی گەنجەکانمان‌و سەری‌زمانیان بە شتی خەتەرناك نەکەوێتەخروو..!!

ئەو کارە بەبێ پرۆژەی وەرگێران چارەناکرێ، ئەویش پێ‌ویستی بە رەنگ‌رێژە. نەوەك ببێتە ئاژاوەگەری‌و کردەهەرزەیی‌و هەوەس‌تاودان، دەناکاتێ بەخۆمان دەزانین کە سیمای نەتەوایەتیمان رووشاوەو سامانەکەشمان شێواوە...

لەمەوبەر گوتمان: (وەرگێران لە پیناوی چیدا؟) لێرەدا هەندێ نموونە دەهێنمەوە:

– چاك خوازو زانای قانوونی ئەحمەد فەتحی زغلول پاشا کتێبی «نهێنی‌ی سەرکەوتنی ئینگلیزە سکسۆنیەکان» ی نووسەری فەرەنسی – ئەدمۆن دی مۆلان – ی، کردەعەرەبی.

مەبەستی من لێرەدا تەنها پێشەکیەکەی ئەحمەد فەتحیە، کە دەلێ: «ئیگا دەدەمە ئەو نەتەوە ئینگلیزەی کە ولاتان دەخاتە ژێر رکێفی خۆی.. خۆ ئەوانیش ئافەریدەیەکن وەك گەلانی دی!!..

چاو دەبڕمە ئەو کارگەرە داگیرکەرانەی‌کە لەو نەتەوەیەن‌و دانەری کتێبەکەش هەر لە رەگەزی ئەوانە.. نهێنی‌ی سەرداریتی‌ی ئەو کۆمەڵە سکسۆنیەی، ئاشکراکردوە، هەتا ئەوان لە ولاتی ئێمەدابن گەرەکە ئێمە چی‌بکەین؟!...

دەبێ بەراوردی دۆخی خۆمان‌و دۆخی ئەوان بکەین... نەریتی ئەوان‌و نەریتی ئێمە... زانستی ئەوان‌و زانیاری‌ی ئێمە... چالاکی‌ی ئەوان‌و جوولەی ئێمە... سامانی ئەوان‌و هی ئێمە..!!» ئەحمەد فەتحی لەسەر ئەو پێشەکیەی دەڕواو دەلێ:

«مەبەستی من – لە وەرگێرانی ئەو کتێبەدا – بۆ وریابوونەوەو خۆشی‌ی نەتەوەکەمە.. هەستی منیش، هەستونەستی ئەو دانەرە سکسۆنیەیە کە لە پێناوی نەتەوەکەی خۆیدا بلاوی‌کردوەتەوە».

پاشان سالەح جەودەت کەبیر دەلێ:

زیدە بێژی نیە کە بلێم: «ئەو کتێبە یەکێك‌بوو لە هۆیەکانی راپەڕینی نەتەوەکەمان لە باری کۆمەلایەتیداو لەم سەر دەمەیەدا». «٥»

بەچاو خۆمانەوە وەرگێردراوی تاسەشکێنمان کەمە. ئەو بەرهەمانەی‌کە لەپیناوی چاکەخوازی‌و وریاکردنەوەدا بن، تواناو دەرفەتی باشیان‌دەوێ.

لە توێشەبەرەی ئەم کارانەمانداو حالی‌حازر دیاریەکەی «رەسوولی حەمزەتۆف کتێبی‌یەکەم–داغستانی من – پەنجەنمادەکرێ، لەگەلێ میهرو مرۆڤ‌دۆستیدا، هێدی هێدی گوێی ئەوانەش بادەدا کە خویان ناناسن‌و بەسەر هەوارگەی باوانیاندا بازدەدەن... بە دوکەلکێشی خانوەقورەکانی گوندی «تساداسا» ئەوانە قانگ‌دەدا کە لە زینی ئەسپەکانیان دابەزیون‌و لە کەژاوەی هەندەراندا نەبێ، خەویان لی‌ناکەوێ...!!

ئەگەر کارەکەی ئەحمەد فەتحی – لە ورگێرانی «سر تقدم السکسۆنینن» بۆ شارەزابوون‌بێ لە بارەی (نەرم بری‌و زیتی‌و پێشکەوتنی سکسۆنیەکان) کارەکەی مامۆستا عەزیزگەردیش (لە وەرگێرانی داغستانی من دا) دەرگایەکە بۆ خۆدۆزینەوەو مرۆڤ دۆستی. دوای ئەو نمایشە ئیدی پی‌ویست بە کوتانەوەی ئەو پرسیارە ناکا:

وەرگێران لە پێناوی چیدا...؟!»

کەواتە بەر لەوەی‌کە نووسەر بە کەیفی خۆی و بوکەیفی خۆی بەرهەم وەربگێرێتە سەرکوردی، با لە لووتکەی گەل‌و نیشتمانەکەیەوە تیی‌هەلبروانێ.

**بۆ راپەڕینی** ئێستامان، دانان یان وەرگێران؟ ئەگەر (دانان) زەوادبێ، وەرگێرانیش پی‌خۆرە. هەردووکیان شان‌بەشانی یەکدی پی‌ویستن. بەلام بۆ بابەتی زانستی وەرگێران لەسەرەوەیە، چونکە کاروانی گەلانی پێش‌کەتو سوارەن‌و ئێمەش پیادەین.. بەتایبەتی ئەو زانستانەی کە پەیوەندیەکی گرنگیان بە باری‌ژیان‌و هەل‌کەوتی نیشتمانەکەمانەوە هەیە.

ئەو زەمینەیەی‌کە دانان دەخاتە ژوور وەرگیرانەوە بریتیە لە ئەدەب‌ومێژوو (زمانیش لە هەمان بواردا) چونکە ئەدەبی هەر نەتەوەیەك مێژووی دەروونی‌ی ئەوگەلەیەو زیندە وێنەیەکە لە ژیانە راستەقینەکەی، شتێك‌نیە وەك کوتالێ لە هەندەرانەوە باربکرێ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە پێشوازی لە بەرهەمی ئەدەبی‌و هونەری‌ی نایاب نەکەین.. ئەوانیش پی‌ویستن، هیچ‌نەبێ بۆ پێوانەو هەل‌سەنگاندنی بەرهەمە خۆمالیەکانمان

لەگەڵ هی دەرەکیدا . . یان وەك رابەرێك بۆ کاری پەسندمان .

**وەرگێرانی**یەك بەرهەمو بۆ چەند جارێك کارێکی رەوانیەکە یەك شت . چەندان جار بکوترێتەوە . چونکە کۆشش بە فیرۆدەدا . بەتایبەتی بۆ ئێمەی کەم دەرفەت ، دەبێ .

لەوەش بە ئاگابین کە ئەو بەستنەوەیە بەزەحمەت سەردەگرێ . گریمان بەرهەمێك بە کرچی وەرگێردراو بەکێکی دیکەش مافی خۆی دایە . ئایا لەمیان قەدەغە دەکرێ؟!

- نموونە (گولستانی سەعدی ) شاکاریکەو بۆخۆی . مامۆستا زەکی هەناری کردویە بە کوردیو مەلامستەفای حاجی مەلارەسووڵیش دیسان کردویە بە کوردی ، جیاوازییەکی زۆریان لە نێوان‌دایەو هی‌ئەویان وەرگێرانێکی دەقاودەق پچرپچرەو کارەکەی مەلامستەفاش سەرکەوتوانەیە . هەرچۆنێك بێ ئەو بەستنەوەیە لەوزەی دەزگای دەسەڵاتداردایە . ئەوان دەتوانن رێگە لە بەرهەمی لاوازبگرنو شتی بەکەڵکیش رابپەرێنن .

**سەرگوزەشتەیەك** : (٦)

«مەولەوی دەڵێ جارێکیان بە سەفەر چووم بۆ - قەلای جوانرۆ - لەوێ کتێبێکی (شیرینو فەرهاد) ی ناتەواوم بینی . زۆر لەلام ناسك بوو .

ویستم بە شیعری خۆم تەواوی‌بکەم . . دەستم پی‌کردو چەند شیعرێکم نووسی . کە هینەکانی خۆم لەگەڵ ناتەواوەکەدا بەراوردکردن لە ئاقار خۆمدا شەرمەزار بوومو دەستم لە نووسینەکەی خۆم‌هەڵگرت .

لێرەدا دەگەرێینەوە بۆ دادگای ویژدان . هەرکەسێکی وەرگێر بێتو ئەوەندە بە ئینسافبێ بەرهەمێك کە بەنایابی وەرگێردرابێ . دەستی تێوەرنادات‌و چەواشەی‌ناکاو نای‌کوتێتەوە . دووریش‌نیە کە مەولەوی وازی لەو بەرهەمە هێناوە . لەبەر ئەوەبووبێ . . . کە رۆژێ لە رۆژان نوسخەی تەواوی لە قوژبنێکەوە سەرهەڵدەدا . دانی‌بەوەشدا هێناوە کە شاعیری ئەو بەرهەمە لەو بەهرەمەندتر بووە . ئیدی هیچ پێویست بە تێهەڵچوونەوە ناکا . نەخوازەلا کە کارە پێشوەکە نایابتر بووبێ . رێشی‌تێدەچی کە ئەو بەرهەمە ناتەواوە بەشێك بووبێ لە شیرین‌و خوسرەوەکەی خانای قوبادی کە لە «٩٧٥» چاپ کرا .

## شیعر وەرگێران

- زاراوەی «شیعر وشاعیر» :

بەرابەر بەو دوو زاراوە ، لە کوردیدا چەند وشەیەك لە هێنان‌و بردنی نەیساوەدان ، ئەمەش نموونەیەکی زەقە لە بێئارامی‌ی زمانی نووسینماندا ، ئەم بێئارامیەش نەگریسترین کۆسپە لە بواری وەرگێراندا ! !

کارەساتی زاراوەی لەق‌و نابەجێ ، لە تێنەگەیشتنی نیشانکردی (نووسین بەکوردی‌ی پەتی) یەوە ، کەوتوەتەوە . بەگشتی ئەو دروشمە ، لە خۆیدا پیرۆزە ، بەلام بە یەك تەکان نای‌گەینی‌و رەوتێکی هێنانەی گەورەکە ، هیچ زمانێك نەی‌توانیوە ، وناشتوانێ سنوور لە - بەخشین‌و وەرگرتن- دابخا . ئەو دیاردەیەش لە زمانێکەوە بۆ زمانێك بەندە بە باری مێژووی‌و هەڵکەوتی گەلانەوە ، هەندێ زمان وای بۆ رەخساوە کە بەلێشاو ببەخشێ‌و کەمتر وەربگرێ ئەویش بە هۆی باری شارستانی‌و رامیاری‌و ئاینەوەیە ، زمانەکەی ئێمەش وەرگرتنی پترە لە بەخشین . ئەمەش نەنگی‌بێ‌و نەنگی‌نەبێ دەسەڵاتی رۆژگارە .

بەرابەرکێی ئەو دوو زاراوەیە :

١ - شعر = هەڵبەست . .
- شاعر = هەڵبەستەوان ، هەڵبەستیار . .
٢ - شعر = هۆنراو ، هۆنراوە .
شاعر = هۆنەر ، هۆنەرەوە .
٣ - شعر = ( . . . )
- شاعر = هەستبار (٧)

مامۆستا ئەحمەد هەردی (وەك شاعیر بەم چەشنەی خوارەوە رای خۆی دەبریوە . (٨) «بەلای منەوە وشەی (بویژو هەڵبەست‌و هۆنراوەو ویژە . جێگەی (شاعرو شعرو أدب) ناگرنەوە . بەلام بەکارهێنانی (هۆنراوە)یان (هەڵبەست) لەباتی (نظم) تا رادەیەك رێی‌تێدەچێ . ئەبێ دان‌بەوەدابنێین کە ئەم سێ وشەیە (شاعر ، شعر ، أدب) ئەمەی دواییانی لێدەرچێ کە کورد بە مەعنایەکی‌تر بەکاری ئەهێنێ . ئەوانی تریان زۆر بەی کوردزمان تێیان‌ئەگات . چونکە دەمێکە هاتوونە زمانی کوردیەوە . . کە ئەمە دەستوورێکە هیچ زمانێکی زیندوو نەی‌توانیوە خۆی‌لی‌بپارێزێ . «قورئانی پیرۆز کە کتێبێکی ئاسمانیە پتر لە سەد وشەی وەکو (فردوس ، جهنم ، کنز . . هتد تێدایە .

هەندێکیان فارسی یا رۆمی یاحەبەشین . بۆ الاتقان في علوم القرآن . قاهرە ١٩٥١ —» .

بەلای منەوە رایەکەی مامۆستا هەردی هەڵوێست ژیرانەیە . بەلام بە خواستی ئێرەو هەمان بۆچوون ، سورێکی دیکەی دەوێ لە مەیدانی فیلۆلۆژی «فقه اللغة» دا .

— **عەقاد ، دەڵێ** :

« وشەی   شعر — لەگەڵ ئەوەشدا کە گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتوە ، لەنێو زمانە سامی نەژادەکاندا — دەچێتەوە سەر ئەسڵە عەرەبیەکەی ، بە پێی تێ‌روانینی زمانەوانە بڕواپێ‌کراوەکان ، وشەی «شیرو» لە ئەکەدیی کۆندا بە واتای دەنگ‌کێشان‌و ئاوازدانەوەی سروودەکانی نێو پەیکەرەکانە ، لەوێوە گوێزراوەتەوە بۆ عیبری‌و بێژەی «شیر» ی سازاوە کە بە واتای سروودگوتنە . .

لە وێشەوە بۆ ئارامی‌و دەبێتە هاو واتای (شور) و (ترتیل ، ترنم) بەهەمان مەفهوم‌و بە عیبری بە کتێبی (نشید الانشاد) دەگوترێ :

«شیر هشریم» . .

دوونیە کە ئەو گۆڕانەش راگوێزی وشەی «شعر» بێ بۆ وشەی «شیر» ئەمەش دەسەلمێنرێ کە بزانین دەنگی —ع— و برێ دەنگە گەرووی دیکە ، لە ئەکەدیی کۆندا نەماونەوە . . هەر وەك لە زوربەی زمانەکاندا ، تێداچوونی چەند دەنگێك رووی‌داوە . . .» . (٩)

با برێك دابکشێین بۆ زاراوەکانی لەمەڕ خۆمان :

٭ هۆنراوە = شیعر . هۆنەر = شاعیر . هەندێ دەڵێن : هۆنراو . هۆنەرەوان . . . لە رووی وشە سازیەوە (هۆنەرەوان ) دەقی ئەم مەعنایە دەدا بەدەستەوە :

١ — ئەو کەسەی شوانی ئەو کەسانەیە کە گوریس . ملوانکە . رست . . . . دەهۆننەوە بان چاودێری ئەوانەیە . بە پێی واتای فەرهەنگی .

٢ — ئەو کەسەی کە پاس‌و پارێزگاریی شاعیر دەکا . بەپێی لێدانەوە مەجازیەکەی . چونکە (هۆنین   ین = هۆن + ەر = ئاوەڵناوی کارا = شاعیر ا وان = شاعیرەوان .

— هۆنراو — ئاوەڵناوی بەرکار . نامۆیە چونکە کارەکەی بە هۆی مۆرفیمی (ەوە) وە دەکەوێتە گەردان . کە بڵێینی :

(نازەنین پرچی دەهۆنێتەوە . . ناگوترێ . . . دەهۆنێ .

جارێ (هۆنراوە) کە بۆ «نظم» بێ ، بەکار هێنانێکی خوازەکاریەو لە فۆرم‌و روخسار دەربازنابێ ، وەك هۆنینەوەی بەرمۆرو رست ، بە هیچ کلۆجێك لایەنی ئەندیشەو راونین شاعیرانە ، نێوجەرگە ناکا . بە لێدانەوەیەکی‌دی (هۆنەرو هۆنراوە) بە خوازەشەوە دەبنە ناو بۆ لاشەی شیعرو شاعیر ، نەك بۆ گیانیان .

بە نموونە کە بڵێین :

(هەلوربلور تەکامە ٭ زەردو سوورو شەمامە . هۆنراوەیەو فرێ بەسەر شیعرەوە نیە .

ئەم خوازەکاریە کوردیە جێگەی خوازەکاریە ئەکەدی‌و عیبریەکە ناگرێتەوە ، لەویاندا پەیوەندی واتای بەرابی بە واتای نوێ‌بووەوە بەشەکی و جزئي) لایەنی فۆرمە .لەمیاندا پەیوەندیەکە هەمەکی «کلی»یە . . بۆچی ؟

نەرەو ئاوازە دەنگی سروود ، لەسەر چاوەیەکی پیرۆزەوە (هەیکەلی پەرستگاکان( بە دوولانەیە ئاوازی لەبار لە رشتە وشەی رێکەوە هەڵدەستێ سروودیش دەبێ لایەنی سۆزو جونبوشی تێدا رەچاوبکرێ .

٭ لەهەمان دەربازگەوە بۆ تاوتوی وشەی (هەستیار = شاعر) کە تازە بەتازە   د . کامل بصیر — پەسندی‌کردوە .

**شی‌کردنەوەیەك** :

— هەست = حس + پاشگری — یار = هەستیار : خاوەنی هەست . . لەسەر هاوکێشەی — جووتیار : خاوەنی ئیشی جووت .

بە یاسای زانستی گەردان : (علم الصرف) کە وشەی ئاوەڵناوی کارای (هەستیار) سازدرا . دەبێ لە هەمان بنکەی (هەست) چاوگە ناو (اسم مصدر) یش بۆ (شعر) دابرێژرێ‌و بگوترێ : (هەست‌و هەستیار ) وك (جووت‌و جووتیار) یان بە رێژەناو بگوترێ (هەستی . هەستانە = شعر) یان بەهۆی مۆرفیمی (وەر) و لەسەر ئاهەنگی (زیندەوەر . جانەوەر) بگوترێ (هەستەوەر = شعر) . . ! ! باری پێ‌راهاتن‌و زەوقیش لەولاوە بوەستێ .

— وادەزانم کە لە شی‌کردنەوەی وشەی (شعر) دا . برێ زمانەوان زەینیان ترازابێ . واتە وای بۆ چووبن کە (شعر) لە چاوگی (شعور( ەوە دابەزیبێ . بە پێی لێ‌کۆڵینەوەکەش . لە (شیر و شوری) ئەکەدی‌و عیبریەکەوە بوو .

دەگەینە ئەم قەناعەتە : «ئەگەر هەستیار - بەرابەر بە - شاعر بێ . دەبێ هەنگ‌و تاوسیش شاعیر بن . چونکە ئەوانیش هەستیان تێدایە . خۆ ئەگەر (هەست) بەرابەر بە (حس) نەبێو بەرابەر بە (شعور) بێ . ئەوا هەموو ئادەمییەك . شاعیرە . .؟!! .

شی‌کردنەوەی زاراوەی (هەڵبەست) پێك‌هاتنەکەی : چاوگی (هەڵبەستن ن = قەدە چاوگ (هەڵبەست) بەبێ هیچ پێشگرو پاشگرێك . کراوە بە ناوی بەشێك لە ئەدەب وشەیەکی دارێژراوە لە پێشگری (هەڵ + قەدە چاوگی - بەستن . ئەگەر لێك‌دراوبوایە وەك (باربەست) یان (داربەست) دەشیا بێتە ناو . یان بە هۆی بزوێنی (ە) وە بێتە چاوگەناو . وەك (پرسین - ین = پرس + پاشگری - ە - = پرسە . کەواتە داتاشینی (هەڵبەست) بۆ هەمان مەبەست لە دەستووری زماندا ، ڕێزپەڕە . کەواتە ئەگەر گوێ بەنێوەرۆکێش نەدەین . دەبێ قاڵبەکەی (هەڵبەستە) بێ .

### واتا فەرهەنگیەکەی :

- بە سادەیی (بەستن ) = بەندکردنی شتێك بەشتێکەوە . ئەم واتایە ڕەهاو مەرکەزیە . ئەوەی‌تێدا دیاردی ناکرێ . کردەوەی (بەستن)ەکە بەرەوژوورە . بەرەوخوارە . یان پۆییە ، یان بەرەوناخە . . . کە هەریەکێك لەو خاسیەتەکارە بەهۆی چەندپێشگرێکە . وەك (تێ‌بەستن . لێ‌بەستن . دابەستن . . . هتد .

بەڵام بە هۆی پێشگری «هەڵ» ەوە . بەرەو ژوورانە کردەوەی - پێوەبەستن دەگەیەنێ ئەم ڕووداوە بەرجەستانە لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ :

- سەرینەی ئاشی هەڵ بەست : چینی لێنانی کەڵەك بەرەو بەرزی .

- قاچی بزنەکەی هەڵ‌بەست :

بەرەو سەروو هەپەی داری لێ‌بەندکرد ، تا جێی خۆی بگرێتەوە .

- دەمی هەڵ‌بەستبوو :

بەرەو ژوور بە لفکەی مێزەر یان دەستەسر بەری‌گرتبوو ، وەبەری هەڵ‌نابوو . . .

- هەوجاڕ هەڵ‌بەستن :

دەم‌دانی پارچە پارچەی ئاموور بەشێوەیەکی حاددەو بەرەو سەروو . . هتد .

لە بنەرەتدا پێشگری «هەڵ» ڕوودانی کار ، بەرەوژوورانە ئاراستەدەکا . وەك (سنگەکە بەزەویدا داچوو) یان (شێرەکە هەڵ‌چوو) : بەرەوژوور سەری‌کرد . . جا - ئەگەر لە جووڵاندنی بەرەوژووریش دابەزێ ، دەبێ تارادەیەك ئەو تایبەتە نەدۆڕێنێ .

- واتا ڕەوانبێژیەکەی :

هەر لەم دەمدانو پێوەبەندکردنو پێوەهەڵ‌سەپاردنەوەوە ، بە خوازەکاری کورد دەڵێ : «قسەی بەدەمەوە هەڵ‌بەست» واتە درووی بۆ سازاندو بەچەشنی دەمەوانە بە بەردەمی هەڵ‌دا . کەواتە پەیوەندی‌ی واتایٔ بنجی و واتای نوێ‌باو پێوەبەندکردنو پێوەهەڵ‌واسینە .

گفت‌و قسەی لە لاوە بەندکراو لە توخمی ساختەو دەلەسە تێ‌ناپەڕێ . .

هەرکاتێ بە «شعر» مانگوت :

- هەڵبەست بە ڕێژگەهەڵەکە . یان هەڵبەستە بە ڕێژگە تەواوەکە . دەبێ لە بوختانو درۆپاڵدان دەرنەچێ . شیعریش گەلێ لەوە مەزنترو شکۆدار ترە . . !!

من بەبێ هیچ نیگەرانییەك لەو زاراوە ناسازانەم کۆڵیەوە . خوای‌کردو وشەی پراوپڕو پاکزای لەمەڕ خۆمان دۆزرایەوە . ئەوا پێشوازییان‌لێ‌دەکرێو لەم کارە ڕەهاتەش ڕزگارمان دەبێ .

## شیعر لە زمانێکەوە بۆ زمانێك

جاحظ بڕوای وابووە کە نابێ شیعری عەرەبی وەربگێڕدرێتە سەر زمانێکی‌دیکە . چونکە کێشە عەرەبیەکان موعجیزەیەکی تایبەتین‌و شایستەی خۆیانە . .

بەهەمان مۆسیقاو ئاوازەوە . ڕاگوێزناکرێن . ئەمەش ڕێ‌لێ‌گرتن‌و قفڵ‌دانە . ! !

هەندێکی دیکەش هەر لەو باوەڕەدان کە شیعر وەك خۆی وەرناگێڕدرێ . ئەم ڕایە دەرگا لێ‌داخستن‌نیەو ڕێشی تێ‌دەچێ . چونکە هیچ کەسێ ناتوانێ بچێتە ناخی ئەندێشەو ڕوانینی شاعیرەوە . . هیچ زمانێکیش ناتوانێ کوتومت وێنەی زمانێکی دیکە بگرێ .

بەڵام شاعیری داهێن دەتوانێ تەواو لە ئەسڵەکە نزیك‌ببێتەوەو گیانە شیعرەکە نەچروسێنێ .

خۆ ئەگەر دوو زمانەکە هاوخێڵ‌بن ، ئەوا کارەکە گونجاوتر دەبێ . کەواتە بۆ بەراوردی هەندێ نموونە :

خەیام دەڵێ :

«اين كوزه چو من عاشق زارى بوداست دەربند سرزلف
نيگارى بوداست اين دسته كه درگردن او مى بينى دستيست كه
درگردن يارى بوداست»

شێخ سەلام ئاواى وەرگێڕاوەتە سەر كوردى :

«ئەم گۆزە وەك من عاشقێ بوو زار
بە تاڵى زوڵفى يارێ گرفتار
ئەو دەستە ئێستە تەوقى مليە :
دەستێ بوو كام دەست ؟ دەستى ملى يار»

ئوستاد عبد الحق فاضل هەمان چوارينەى كردوەتە عەرەبى :

«كانّ هذا الكوز مثلي عاشقا جد كئيب سحرته طره المحبوب
بالحسن العجيب وتأمل عروة في جيده موثقة
فلقد كانت ذراعا طوقت جيد حبيب»

ديسان وديع البستاني بە شيعرەوە دەڵێ :

«وكأني بالكوز قد كان صبا
مبعَدا أملا دنوا وقربا
هائما مائتا غراما وحبا
وكأني بعروتيه ذراعا
عاشق ضم من أحب وداعا»

بابزانين لەو چوارينەيەدا كاميان نيشانە شكێنترە ، بەچاو – سەلام ەوە : دارشتنەكەى (خەيام( لە نيوە شيعرى يەكەمدا ئاوەڵناوى (زارى = پەريشان) ناپسێنێتەوە تەگەرەى نەخستوەتە رستەسازيەوە . لە كورديشدا هەمان رستەسازى بەو شێوەيەيە ، كەچى سەلام – ئاوەڵناوى (زار = زارى) ترازاندوەو ، كارى (بوو) ى پێش خستوە . ئەگەر لەبەر لەنگەرى شيعرەكەى نەبێ بە هەڵەيەكى رێزمانى دادەنرێ لەبەر هەمان ناجارى (زارى) كردۆتە (زار) . لە نيوە شيعرى دوەميدا . دەقەكەى خەيامو بەدارشتنێكى كوردانە پێكاڵ پێك دەبن كە بڵێن : (اين دسته كه درگردن و مى بينى = ئەو دەسكەى كە لەگەردنى ئەودا دەى بينى) ئەم كردويەتى بە ( . . . ئێستە تەوقى مليەتى) لە نيو دێرى دواييدا كارى (بوداست) ى لابردوەو پرسيارى (كام دەست؟) ى لێ زيادكردوە رستەسازيەكەى خەيام بێتو لە پەخشانێكى كورديدا وشە بەوشەبێ لەگەڵ دەستوورى زمانەكەماندا گونجاوترە لە رستەسازيەكەى سەلام . لەگەڵ ئەوەشدا سەد ئافەرين لە شاعيرمان كە ئەمانەتەكەى پاراستوەو گيانە ئەسڵەكەى نەشێواندوە ، ئەمەش بەچاوپۆشين لە كەمێك ئاڵوگۆڕ .

لێرەدا تەردەستى بە لاى (عبد الحق فاضل) ەوەيە . كە بەو زمانە دوورەنەژادە توانيويەتى دەقاودەق وەرى بگێرێ لەگەڵ كەمە جياوازييەكدا هەستە شيعريەكەشى پاراستوە . بەو دارشتنە بێگەردە عەرەبيە . كەسێ فارسى زانيش نەبێ . پێى فێرى زمانەكەى خەيام دەبێ بەلام وەرگێرانەكەى وديع بستنى ئەوەندە لە ئەسڵەكەوە دوورە . بە نيوەدێرى (وكأني بعروتيه ذراعا) نەبێ . زەين بۆ ئەوە ناچێ كە تەرجەمەى چوارينەكەى لەمەر خەيامە .

## هەڵبژاردنى وشەو زاراوە

١ – پەيدابوونى چەند زاراوەيەك بۆ واتاى يەك وشەى بێگانە :

ئەمە كارێكى ناهەموارەو دەبێتە مايەى رێسەو نەكۆكى . نە دەتوانرێ بەرابەر بە يەك واتا يەك زاراوە دەست نيشان بكرێ و وەرگێرەكە . بارى لێ نەگورێ . بە نموونە لە عەرەبيدا «الانتماء . الانضمام . المنتسب » هەموويان نەبێ يەكدى بەكاردەبرێن ، لێرەدا پێويست ناكا وەرگێرەكە لاسايى سەرجەمى ئەم وشانە بكاتەوە :
«خۆخستنە ناو . هاتنەريز . هاتنەناو . لەگەڵ كەوتن . سەربە . . .» بەپێى ليستە زاراوەكانى كوردى .[10]

## ٢ زاراوە جيهانيەكان :

ئەو زاراوانەن كە نەتەوە پێشكەوتوەكان لەسەرى پێك هاتونو هيچ گەلێك سڵيان لێ ناكاتەوە ئێمەش لە لايەن خۆمانەوە بەكاريان دەهێنين جا بە كەمە گۆرانێكى دەنگسازيەوە بێ يان وەك خۆيان . وەك : «تەلەفۆن . پێويست ناكا لە واتاى (هاتف ) ەوە وشەسەكى بۆ سازبدەين و بڵێين دەنگ كێش . دەنگ هێنى . يان تەلەدەنگ . سيمەدەنگ . . .هتد . يان وشەى Film – فلم سواوەتەوەو بووەتە «فليم = Filjm وشە سواوەكە جێى خۆى گرتوە .

٣ – پاراستنى تايبەتە زمانيەكان بە پێى جۆرو شوێن – رێدەكەوێ لە زمانێكدا و بۆ يەك واتاو مەبەست تاكە وشەيەك لەكارايە كەچى لە كورديدا بە چەندان وشەى تايبەتى . بە خواستى شوێن و گروپ بارى لێ گۆرداراوە . جا ئەگەر شارەزاى

ئەو وشە فۆلکلۆریانە نەبین ئەوا وەرگێڕانەکەمان دەبێتە مایەی جەفەنگ بەنموونە :

بەرابەر بە (نکافـو زوکام) کورد دەلێ :
«گایەکە گاوە ناسیەتی»
«پیاوەکە هەلأمەتیەتی»
«مەرەکە پزوویەتی»
«کەرەکە مقاویەتی»

جا ئەگەر گوترا : «کەرەکە هەلأمەتیەتی» یان «ئافرەتەکە پزوویەتی» ئەوا شکۆی زمانەکە دەڕووخێ .
یان لە عەرەبیدا ئەوە سەریگرتوە کە بڵێن :

« - کثافة النفط لە کیمیادا
کثافة الغابة لە دارستاندا
کثافة السکان لە جوغرافیەدا
- کثافة اللحیة لە رووخساردا»

کەچی لە کوردیدا بە پێی هەرچوار شوێنەکە وشەی تایبەتی داوە بەدەستەوە . کە دەڵێین :
« نەوتی خەست
دارستانی چڕ
- شاری جەنجەڵ
- ریشی پڕ .»

کەواتە هەرزمانە خاسێتو تایبەتی خوی هەیە .

**٤ - چێژو هەست لە وشەدا**

لە هێڵەگشتیەکانی هونەری وەرگێڕاندا بەم چەند خاڵەیەی خوارەوە ئاشنادەبین :
«چێژ . باوی گشتی . ئاسنگۆیی . هەست پاراستن لە گوتن و مۆسیقاو واتادا »
٥ - کارپەسندی لەوەدایە کە تاکە وشە بەر ستەیەك لێ نەدرێتەوە . . تا دەتوانرێ رستە بۆرستەو گرێ «عقدە» بۆ گرێ . . .
لە کوردیدا موعجیزەی وشەی داڕێژراوو لێك دراو دیاردەیەکی خۆماڵیەو رستەو دەستە رستەیان پێ دەکرێنەوە بە تا گەوشە .
لەم بارەیەوە بابەتەزانستیەکان ئەو دیاردەیان تێدا رەچاودەکرێ . چونکە زاراوەکانیان دیاریکراون و زوربەشیان بەرجەستەن .
بەش بەخۆم پیرۆزبایی لە لیژنەی وەرگێڕانی کتێبی (زیندەوەرزانی و دروستی)ی قۆناغی نێوەندی و ئامادەیی دەکەم . نێوبەنێو لەگەڵ مامۆستا فوئاد عیزەتدا دەکەوتمە چەندو چۆنی وشەی لێك دراوەوە . بە تایبەتی لە وەرچەخاندنی سیفە لەسەر مەوسووفـو دارشتنی لە قالبی لێك دراوداو گێڕانەوەی ئەو تایبەتیە زمانیەمان بۆ هەوارگەی خۆی .
زۆر بەجێیە کە نووسیویانە :
«ماسولکەریشاڵ = الألیاف العضلیة .
ماتە وزە = الطاقة الکلمنة .
گەرمەوزە = الطاقة الحراریة . . .»

کەمێ لەمەوبەر ئەوەمدرکاند کە یەکێك لە مەرجەکانی وشە هەڵبژاردن پاراستنی هەستو نەستی مەعنەویە ، بەنموومە : شێخی طهطاوی کە زانابووەو کتێبی زیندەگانی فەرەنسەی وەرگێڕاوە ، دەستە واژەیەکی فەرەنسەیی کردوە بە «الخفر الجنسي»[١١] ئەمە لەباتی ئەوەیکە بنووسێ «الحرس الوطني . الحرس الأهلی» دیارە بە تەوژمی شەرمو حەیا ، خەڵکی لەو دەستەواژەیە دەتەکێتەوەو لە زەینی عەرەبیزاندا «حرس أهلي» نادا بە دەستەوە . جا ئەگەر (خەفەت جنسی) یەکەی لەمەر طهطاوی بکەینە کوردی ، دەبێتە مایەی شەرمەزاری ، ئەمەش لە هەلومەرجێکدابێ کە مەبەستمان «بەرگریی نیشتمانی» بێ . . ؟! .
ئەو دەردە کە تووشی زمانێکی وەك عەرەبیو پانوپۆڕ بووبێ دەها ئەوەندەش بەرەنگاری ئێمەبووە .
کەواتە دڵیاکانەو بەبێ هیچ نیگەرانیەك چەند نموونەیەکی خوشمان دەخەمە بەرچاو :
١ - تەراتێن = مسابقة .
٢ - فرۆکەیفووکەرە = الطائرة النفاثة
٣ هەڵپە = حملة »[١٢]

- مسابقة : واتایەکی بەرینی ناسکی هەیە . بەڵام وشە تازەکەی ئێرە : «تەراتێن» بە خوازەو بۆ داشۆرینو گاڵتەجاری جێی خۆی دەکاتەوە . دوورەو بەرتەسکە بۆ ئەو مەبەستە هێمنەی

كه (مسابقة) دەیگەیەنیٚ . گریمان ئەم رستەیەمان کردەکوردی : (نعتز بهذه المسابقة الأدبية) بەو حیسابە دەبیٚتە : «شانازی‌ی بەو تەراتیٚنە ئەدەبییەوە دەکەین» سەرەرای هەمووی ، وشەکە – تەراتیٚن – لە زەینی ئیٚمەدا ، نمایشە بۆ (هەڵتیزان‌و راوراویٚم‌و غاردانی ولأخە بەرزەی ئاغرو سەرشیٚت» .

وشەی «نفاثه» لە زەینی عەرەبی نەژاددا سەنگین‌و بەجیٚیە . حسه واتاییەکەی «فووکەرە» ی لەکن ئیٚمە ، بابەتی مووشەدەمە ، یان پەمپەهەوا ، رادەگەیەنیٚ . ئەگەر هەمان (فووکەرە) ببیٚتە ئەسڵ‌و دقاودەق بکریٚتە عەرەبیٚ ، دەبیٚتە (النافخه) . . هیچ عەرەبی‌زمانیٚکیش ، قایل نابیٚ کە بۆی بنووسریٚ :

«الطائرة النافخه = فرۆکەی جیٚت»!! .

زاراوەی (هەڵپە) واتای (حمله)ی پی‌دابین‌ناکریٚ ، گریمان (الحملة الوطنية )مان وەرگیٚراو گوتمان (هەڵپەی نیشتمانی) هەرگیز گەرموگوری‌ی (هەڵمەتی نیشتمانی) ناگەیەنیٚ ، چونکە – هەڵپە – سەر بە دزیۆکاریەو بەرابەری «جشع»و چلیٚسیە ، هەر لەم دەربازگەیەوە دەگوتریٚ «فلأن بە هەڵپەیە . . !!» .

## نیگایەك

راستە کە دەگوتریٚ : – «هەروەك –مرۆڤ لە یەك دۆخدا ناوەستیٚتەوە ، زمانەکەشی هەمیشە لە گۆران‌و تازەبوونەوەدایە . . .» لەوانەیە ئەمرۆ ئیٚمە بە چەند وشەو زاراوەیەك رازی‌بین‌و نەوەکانمان لیٚیان بەرگەشتەبن‌و لەگەڵ بیری‌تازەیاندا باشار نەکەن ، ئەمەواو چاوەروانی‌ی ئەوەش دەکری‌کە بە خواستی کاری رۆژانە ، لیٚشاوی زاراوەو بیٚژەی تیٚکەڵەو ئاوەکی ، لووزەوبستیٚنیٚ جا زربن ، رەسەن‌بن ، دورەگ‌بن ، ئەمانە هیچ هیٚزیٚك ناتوانیٚ لە زمانی قسەدا ، بەربەستیان‌بکا . لە ترسی ئەم خاڵە سامناکە نەتەوە سەرکەوتووەکان زمانی نووسینیان بە دەستووری تایبەتی دیاردی‌کردووەو بەچەندان زانست پاسی‌دەکەن‌و لەسەر شیٚوەزمانی هۆزیٚك یان هەریٚمیٚکیان پیٚك‌هاتون .

دەست‌مایەو خەرمانی زمانی هەموو نەتەوەیەك بابەتی فۆلکلۆری‌و کەلەپووری دیٚرینیانە ، نووسەر وەرگیٚری یان دانەر یان لی‌کۆڵەرەوە ، هەرچیەکی‌ئەگەر ئەو زەخیرەیەی نەبیٚ دۆش‌دادەمیٚنیٚ . ئەم پرسیارە .

– ئەگەر هەندیٚ وشەی رەسەن‌و فولکلۆری دەست‌چن‌بکەین‌و بە تاوی رەوانبیٚژی‌و بەیانی کوردی ، دایان‌بەزیٚنینە مەیدانەوە بەچ داڵدەیەك سەردەگریٚ ؟ –

تاکە پەناگاو پشتیوان ، بریتیە لە باوەر بەخۆبوون‌و شانازی بە زمان‌و نەریتی دیٚرینمان . ئەگەر لەو روانگەیەوە تیٚ‌بروانین نەزمان دەرووشی‌و نەمایەپووچیش‌دەبین .

## پەراویزو سەرچاوە


١ – مەحموود دەرویٚش – شاعیری فەلەستینی – بەپیٚی ئەم سەرچاوەیە :– هاوکاری / ٢١/١/٩٨٠ .

٢ – نیٚتشە – ألف هدف وهدف . .

٣ – فن الترجمة ص ٩ /الدكتور محمد عوض .

٤ – فن الترجمة في الأدب العربي / ص ٧٣ – محمد عبدالغني .

٥ – هەمان سەرچاوەی پیٚشوو .

٦ – دیوانی مەولەوی ل . أ . / مەلا عەبدولکەریمی مودەریس .

٧ – زاراوەی کوردی ل ٩٩ د . كامل بصير .

٨ – گۆڤاری برایەتی ، ژ ١٠ ی ٩٧١ .

٩ – اللغة الشاعرة ، ص ٢٨ – عباس محمود عقاد .

١٠ – زاراوەی کوردی ل ٩٥ ، هەمان سەرچاوەی پیٚشوو .

١١ – « فن الترجمة في الأدب العربي ص ١٩٥ هەمان سەرچاوە .

١٢ – خویٚندنەوەی بەسوودی سەرەتایی چاپی ١٩٧٩ .

١٣ – وەرگیٚران هونەرە – جەمال نەبەز – ٩٥٨ .

١٤ – زمانی کوردی‌و هونەری وەرگیٚران – کەریم زەند – ٩٧٧ .

١٥ – أصوات و اشارات أ . كوندراتوف – ترجمة ادورد يوحنا – ٩٧١ .

١٦ – الموسوعه الصغيرة رقم – ٥٣ – –د . ابراهيم السامرائي .

١٧ – دەست‌نووسی – چەند تایبەتیٚکی زمانی کوردی رەئووفی ئەحمەد ئالانی .


تی‌بینی : لە کۆریٚکی رۆشنبیریداو لەهۆڵی – دار المعلمات – لە سلیمانی . . لەرۆژی ١٧/٣/٩٨١–دا ، خویٚندرایەوە .

# رابواردنی کوردەواری لە یادداشتی بێگانەکان و شیعری شاعیرەکانماندا

**جەمال بابان**

کۆمەڵی کوردەواری وەك زوربەی کومەلانی تر ، کاتی حەسانەوەو بێ ئیشی خۆی بە دەمەتەقێ و گاڵتەوگەپ و یاری و وەرزش رابواردوە ، راوی کردوە ، سواری ولاغ بوە ، نیشانی ناوەتەوە . رۆڵەکانی کورد بە شەو لە دیوەخانانداو لە ماڵاندا میروگزیرو کلاًوکلاًوین و لە بەهاردا سەیرانیان کردوەو ئاژاڵ و سەگ و باڵندەیان راگرتوەو پێ گەیاندوە بۆ شەڕ . کە ئەمانەش هەموویان پەیوەندییان بە هەڵکەوتنی کورد خۆی و خاك ونلاتەکەیەوە هەیەو پەیوەندییان بە مێژووی کوردو بە نەتەوەی کنردەوە هەیە .

کورد شیعری هەڵبەستوە ، گۆرانی رێكخستوە . هەڵبەرکێ یکردوە .

هەرزەکارو گەورە : یاری جوغزین ، نانین ، راوە ژشلك . پاشا بە گەردانی ، سێ باز ، کەوشەك ، یەکەو حەیزەران . فنجانین ، تەشیلە لەبان تەقیلە ، مەلا تەشتەقێنە ، کلاًوێن (گۆرەوی بازي) ، هەڵمەقۆ ، ناغێن ، هەڵاتین ، جنخزین . ئاشە بە تەنگوولێ گولیس کێشەکێ ، قەلە مرداری . چەڵە مشکینە . تەڵەو رێوي ، مۆرانبازی شەڕە بەران ، شەڕە کەڵەشیل ، شەڕە کەو ، شەڕە سەگ ، نیشانیان ناوەتەوە . رمبازیان کردوە . . [1]

منداڵەکانیشیان : ئاخجی و بووخچی . حل حللی ، بل بللی ، عەتەکە عەتەکە . چاوشارکێ ، بووژانەوە . هەی جۆ هەی جۆ (قەلاً قەلاً) خەتخەتێن ، چاو بەستنەوە . راکردن ، هەڕەکان و مەڕەکات ، هەلوکین ، سنجوقین . مزراحین سەر بەدراوێ ، کۆلارە ، بەهەشت و جەهەننەم (پاك و پیس) ، هەلدور بلور ، ساف سافین ، مەلا کوێرە . مورمورێن ، کۆڵکۆڵێن ، حەماموکێ ، ئاش نانەوە . هەنگلە شەلی ، فڕیوە ، پشیلە سوورە ، گەنم گەنم ، ئاگرە . کلاًشێن ، حێولانێ ، چەچە لەزرێ ، هەی دار– هەي دار ، گورك و مەڕ ، کیل و بەردیان کردوە . . . [2]

کچیش ماڵ باجیبنێ و بوگ بوکانی و بوگ و خەسود چێشتەقولی و خەنەبە ندان و ژنگواستنەوەو زۆر یاری تریان کردوە .

ئەم جۆری رابواردن و جۆری یاریانە وردە وردەو یەك لەدوای یەك رەخساوون ، ئەوی دو سەد ساڵ لەمەوبەر بووە . پەنجا ساڵ پێش ئێستا یا لەبیر چۆتەوە ، یانەماوە ، ئەمرۆ بەگوێرەی پێشکەوتن و بەرەوپێشەوە رۆیشتن رابواردن گۆڕراوەو لەگەل هی کۆندا بەینیان زۆر زۆرە . لەکاتێکدا ئەوسا یەکێك دائەنیشت حەکایەتی بۆ ماڵ و منداڵی خۆی ئەکرد ، ئەم جۆرە

ـ بواردنە وردە وردە پەرەی‌سەند ، لە جوارچێوەی ماڵ‌و منداڵ دەرچوو ، دراوسێشی تێکەڵاو بوو ، دوای‌ئەوە گەیشتە دیوەخان ، دوای ئەوە کەوتە چایخانەو شوێنی گشتی‌ی ، واتا ئیستەکە لەبەر ئاگردانو چلا دەرچوو گەیشتە بەر لۆکس ، ئنجا بەر ئەلەتلیك ئێستا ئەو لووداوانە کەوتە سەل فلیم کە لە سینەماو تەلەفزیوندا پیشان ئەدرێن .

مستەر ریچ کە بالیوزی ئینگلیز بوو لە بەغدا لە ساڵی ١٨٢٠ د . سەرێکی لە ناوچەی سلێمانی داوە ، نزیکەی چوار مانگ مەوەتەوە زۆر شتی لەبابەت کوردەوە تۆمارکردوە ، یەکێك لەوانە جۆری رابواردنیانە لە یادداشتی رۆژی پانزەی ئایار دا ئەڵێت : دوای نیوەرۆ مەحمود مەسرەف[٣] خۆی‌و کورەکانی هاتن بۆ لام . حەزیان‌کرد کە شەرە کەوم پیشان‌بدەن . . .

ئەوەندەم نەزانی چەند کەسێك هاتن کە (٣٢) کەوی ناو قەفەزیان بەسەر شانەوە بوو ، کەوەکان هەموو نێربوونو بە قرتە قرت کردبوویان بە هەرایەك هەزار سەعاتی چاڵمە بوایە ئاوا دەنگیان نەئەهات ، هەر ئەوەندە کە کەوێك بەرەڵلا کرا ، بە بانە فرکیّ هاتە دەرەدەو لەسەر پەنجە بە شانازیەوە ئەهاتو ئەچوو ، چاوەریّی کەوەکەی تری ئەکرد . کە بۆیان بەردا ، ئیتر ئەم جووتە بەیەکدا هەڵپرژانو دەنوکیان لەیەك ئەگرت . هەریەکەیان بۆ هەلێك ئەگەرا شوێنیکی ئەوتۆی ئەوی تر بگرێت کە بیبەزێنیّو هەولیشی ئەدا خۆی بەهیچ جۆرێك نەدا بەدەستەوە . بەلاّم ئەوەی تازا بوایە ئەبوایە لاملی بەرامبەرەکەی بگرتایە وەك (سەگی بوول دوگ - لوت پانەکان دوسیّ سووری باشی پیّ بدایە ، تا ئەوی تری ئەبەزان . ئیتر کەوە بەزیوەکە ئەرویشتو تا دو سیّ مانگی تر خۆی بۆ شەر نەئەگرتەوە . کوردەکانیش زۆر بە پەرۆشەوە سەیری ئەم شەرە کەوەیان ئەکرد چونکە کورد حەز لە یاری زۆر ئەکەن ، حەز لەغارغارینو شەرە کەوو شەرە بەرانو شەرە سەگ . . .[٤] ئەکەن .

لە یادداشتی رۆژی سیانزەی هەر ئەو مانگە باسی شەرە سەگ ئەکات ئەڵێت : یەکێك لە سەگەکان هی مەحمود مەسرەف بوو ، ناردبووی لە کۆیەوە بەتایبەتی بۆیان هێنابوو چونکە سەگێکی هێجگار بەخۆوە بوو لە هەمو سەگەکانی تری ئەو ناوچەیە بە هێزتر بوو ، کوردەکان زۆر بە کەیفو خۆشیەوە سەیری شەرەکەیان ئەکردو هەلەلەیان لە سەگەکان ئەکردو قاچیان ئەدا بەزەویدا بەجۆریك لەبەر هەرای ئەوان دەنگی سەگەکان نەئەبیسترا . . .[٥]

لە یادداشتی رۆژی دواتردا ئەڵێت : کورد تەنها ئەو رۆژهەلاّتیانەن کە شەو تا درەنگ نانوونو تا دو سیّی دوای نیوەشەو ناچنە ناو جێگاوە ، بە قسەی خۆشو قەندە کێشانو گورانی رائەبویرن . هەر یەکە لەشەوێکدا دوسیّ ماڵ ئەکات . پیش بانگی ئیوارەش بە سەعاتیك لە مەیدانەکەی بەردەمی ماڵی مەحمود مەسرەفدا کۆئەبنەوە ، قسە لە زۆر شت ئەکەن ، یاخود ولاخ تاوئەدەنو چەکبازی ئەکەن ، یاخود زورانبازی یا شەرە کەوو شەرە سەگ ئەکەن . . . بۆم دەرکەوت کە کورد زۆر کۆمەلایەتین . هیچ گوێم لیّ‌نەبوو باسی یەك بکەن یاخود جنێو بدەن . . .[٦]

لە نووسنی رۆژی (٣١) ئایاردا باسی زۆرانبازی کورد ئەکات کە لەبەر چاویا دو پاڵەوان یەکتریان هێناو دەبرد ئەلیّ : کورد بە گەورەو بچوكو گەنجو پیریانەوە شەیدای وەرزشو جولانەوەن .

لە یادداشتی رۆژی (٣) حوزەیران باسی شیر وەشاندن ئەکات کە چۆن گوایە عوسمان بگ[٧] پارچە لبادێکی چل قەدو تەرکراو لە ئاوا بە یەکەم لیدانی شمشیرەکەی کردویەتی بە دوو پارچەوە . هەروەها چەند کەسێکی تریش دوای ئەو هەمان بەزمیان کردوە .

لە شەوی (١١) حوزەیرانی ساڵی ١٨٢٠ دا باسی شمشاڵ لیدانی دو رەنجدەر (فلاح) ی کورد ئەکات :' ئەڵێت بەستەکانیان پەست بوو - خۆشترین گۆرانیش کە وتیان (ئەیلیّ گیان) و (ئەز دەناڵم) بوو . ئنجا ئەلیّ : شمشال لە قامیش دروست‌ئەکەن . شوانەکان بەکاری ئەهێنن بەتایبەتی لە دەشتو چیادا بۆ گێرانەوەی مەرەکانیان کە ملی پێوەنەنێن و بەم لاو لادا بلاّوئەبنەوە .

هەروەها لە کتێبەکەی (باسل نیکیتین) دا کە باسی کورد ئەکات . بە زمان خۆیەوەو بە زمانی خۆیەوەو بە زمانی هەندێك کوردناسی ترەوە وەك میجەرسونو (ابوفیانی ئەرمەنی)و (لایار) و (مار) . . . لە هۆی رابواردنی کورد ئەدوێن ، بەجۆرێك (میللبخن) لە باسی ئاهەنگێکی ناو کوردەواریداوتویە : ئەو ئاهەنگە زۆر کاری تیّ‌کردم بەجۆرێك منیش کەوتمە شەپۆلی گورانیو مۆسیقاکەیانەوە . تا بەینێکی زۆریش دوای ئەوە لەبەر خۆمەوەو لە خوشیانا ئەو گورانیەم هەر ئەووت ئەووتەوە .

هەر لەوێدا وتویە : دوای گۆرانی ، هەڵپەرکیّ دەستی

پێ‌کرد . بەتایبەتی خۆشیەکەی لەوەدا بوو کە مانگ هەڵهاتبوو ، وەنەبێ هەڵپەرکێ‌ی کوردیش یەك کەسی . یا دووکەسی یا چوار کەسی بێت . بەڵکو هەموو دەست ئەگرن‌و هەڵئەپەرن وەك پەڵە گەنمێکی سەوز کە با شەپۆلی پێ‌ئەدا ، ئاوەها ئەلەرینەوە .[٨]

نالی بۆیژی بەناوبانگی کورد کە لە وولات دوور ئەکەوێتەوەو لەناو زوڵم‌و زۆری عوسمانیەکان سلێمانی بەجێ‌ئەهێڵێت . لە چامە بەناوبانگەکەیدا کە بۆ هاوریێ‌ی بۆیژی ئەورەحمان بەگی سالمی ئەنیرێت‌و کە بە (قوربانی تۆزی رێگەتم ئەی بادی خۆش مرور .

ئەی پەیکی شارەزا بەهەمو شاری شارەزوور) دەست پێ‌ئەکات ، لە یەکێك لە بەیتەکانی چامەکەدا ئەپرسێ ئەڵێ :

ئیستەش کەناری حەوشەکە جێ بازی کەوشەکە
یاری تێ‌دایە؟ یا بووەتە مەعرەزی نفور؟

وا تا ئیستاش گۆشەی حەوشەکە شوێنی یاری کەوشەکە ، وەیا شوێنی بازدانی کەوشەکە ، یاری‌و گەمەی تێ‌دایە ، یا بووەتە پێشانگای لێ‌ی هەلاتن‌و رەوکردن ؟[٩]

ماموستا عەلادین سجادی بە کورتی‌و گەلێك بەجوانی وەسفی کەوشەك ئەکات ئەڵێ :[١٠]

کەوشەك یاری‌یەکە لەو سەردەمەدا – تەنانەت تا ئەم سەردەمەی دواییەش – لەناو فەقی کانا زۆر باوی هەبووە ، لە ئێوارانی هەینی‌و سێ شەنبەدا خەریکی ئەو یاری‌یە بوون . وەکو (کەوشەك)ی پێ ئەلین سێ بازیشی پێ‌ئەلین ، سێ بازی بۆیە پێ‌ئەڵێن چونکە سێ جار بازی تێ‌دا هەیە ، کەوشەکی بۆیە پێ‌ئەڵێن چونکە بۆ نیشانەی بازدەکان کەوش دائەنێن . . .

دوای ئەوە ماموستا سجادی ئەڵێ : ئەم یاری کەوشەکەش ئەوەیە کە چەند کەسێك کۆئەبنەوە ئەچن لەشوێنێکی راستی نەرمانی دا یەکێك لەوانە ئەبێ بە (سەرمەلا) وەیا (وەستا)جۆتێ کەوش ئەگرێ بەدەستەوە . تاکێك لە کەوشەکان لەپێشدا دائەنێ ، ئەمجا لەوێوە بازێك‌و دو بازو سێ باز ئەداو تاکەوشەکەی تر دائەنێ ، باز لەسەر قاچێك نەك دوو قاچ . . .

ئەمجا یەکێکی تر بەشوێن ئەودا باز ئەدا . . . پاش ئەو یەکێکی تر ، هەر بەم جۆرە هەتا هەمو تەواو ئەبن نۆرە دێتەوە سەر وەستا دیسان لە تاکەوشی یەکەمەوەسەرەتای سێ بازەکەی دائەمەزرێنێتەوە ، ئەمجارە بازەکانی بلاوترن . تاکەوشی دووەم ئەگوێزنەوە بۆ ئەو شوێنە کە ئاخر بازی گەیشتۆتێ ، پاش ئەو ئەوانی تریش وەکو جاری یەکەم دێن . تا ئەم دوجارە سەرمەلا ئەوەندە گوێ ناداتێ ، بۆ جاری سێ‌یەم ماوەی بازەکانی گەلێ بلاوترە ، لەم جارەدا وەیا لە جاری چوارەمدا ئەوانەی کە بەشوێن ئەودا بازئەدەن یەکەم کەسیان کە بە سێ جارە بازەکەی نەیتوانی بگا بە تاکەوشی دووەم ئەوەیان ئەبێ دابێ .[١١]

هەر بەم جۆرە ماموستا سجادی وەسفی دابوونەکەش ئەکات ئەڵێ : دابوونەکەش ئەوەیە شوێنی تاکەوشی دووەم ئیتر تێك‌ئەچێ ، ئەم کابرایە کە دائەبێ بە لابەلایی ئەچەمێتەوە ، هەردو دەستی خۆی توند لەسەر هەردوو کلاوەی ئەژنۆی خۆی گیردەکات ، کابرای وەستا گوررێ خۆی دەبەستێتەوە بازێك ئەدا ، تاکەوشەکە لە سەرەتای بازەکەوە رائەنرێ ، بەبێ ئەوە بوەستێتەوە و وزاقی خۆی ئەبەستیتەوە هەردو دەستی ئەخانە سەر پشتی ئەو کەسە کە دابووە ، بازێك ئەدا بەسەریا ، قاچێکی ئەکەویتە لای سەری کابرای دابوو ، قاچێکی ئەکەویتە لای سمتی ، ئەم جۆرە بازەکەی ئەدا ، لە بازی دووەمدا گەیشتە کوێ کابرای دابوو ئەچێتە ئەو شوێنە . ئەمجا بەشوێن ئەم سەرمەلایەدا ئەوانی تریش دێن ، لەوانەیە ئەمجارە وەیا جارێکی تریش هەموویان وەکو سەرمەلا بازبدەن . کە نۆرە هاتەوە سەر سەرمەلا ئەو بەتەواوی گوری خۆی ئەبەستیتەوەو وەکوو جاری پێشوو بازئەدا بەسەر کابرای دابوودا ، کابرا شوێنەکەی خۆی ئەگۆزیتەوەو ئەچێتە ئەو شوێنە ، دیارە ماوە فراوانترا بووە .

لەم جارەدا هەرکەس نەیتوانی بازبدا بەسەر کابرای دابوودا ئەوا تێ‌ئەکەوی‌و دائەبێ کابرای دابوو هەڵبەستیتەوە . ئەوەی هەستابەوە ئەبێ بەسەر وەستاو بەم چورە . . .

لە دواییەکەدا ماموستا علاءالدین ئەڵێ : ئەم یاری‌یە دیموکراتیەتیکی تەواوی تێدا هەیە . گەورەو بچوك . ماموستاو قوتابی تیایا وەك یەك وایە (واتا هەر کەس تێ‌کەوت وکورتی هێنا ئەبێ دابێ . ح.ب)هۆنەری بەناوبانگ (خاکی)لەسەر ئەم یاری‌یە ئەڵێ .

قبوڵ نابێ بەهیچ بابێ کە کورد دابێ لەجێ بابێ
ئەگەر سوختە مەلای جێ هێشت ، مەلا مل‌کەچ نەبێ نابێ

ئەم مەعلومە لای هەر کەس ،چ نادان‌و چ دانابێ
کە دابوون کاری نادانە ، کەسی دانا بێ . دانابێ .[١٢]

پی‌کرد . بەتایبەتی خۆشیەکەی لەوەدا بوو کە مانگێ هەڵهاتبوو ، وەنەبێ هەڵپەرکێ‌ی کوردیش یەك کەسی . یا دووکەسی یا چوار کەسی بێت . بەڵکو هەموو دەست ئەگرن‌و هەڵئەپەرن وەك پەڵە گەنمێکی سەوز کە با شەپۆلی پی‌ئەدا ، ئاوەها ئەلەرینەوە . [٨]

نالی بۆیژی بەناوبانگی کورد کە لە وولات دوور ئەکەوێتەوەو لەناو زوڵم‌و زۆری عوسمانیەکان سلێمانی بەجی‌ئەهێڵێت . لە چامە بەناوبانگەکەیدا کە بۆ هاوریێ‌ی بۆیژی ئەورەحمان بەگی سالمی ئەنیرێت‌و کە بە (قوربانی تۆزی ریگەتم ئەی بادی خۆش مرور .

ئەی پەیکی شارەزا بەهەمو شاری شارەزوور) دەست پی‌ئەکات ، لە یەکێك لە بەیتەکانی چامەکەدا ئەپرسێ ئەڵێ :

ئیستەش کەناری حەوشەکە جێ بازی کەوشەکە
یاری تێ‌دایە؟ یا بووەتە مەعرەزی نفور؟

وا تا ئیستاش گۆشەی حەوشەکە شوێنی یاری کەوشەکە . وەیا شوێنی بازدانی کەوشەکە . یاری‌و گەمەی تێ‌دایە ، یا بووەتە پێشانگای لێ‌ی هەلاتن‌و رەوکردن؟ [٩]

ماموستا عەلادین سجادی بە کورتی‌و گەلێك بەجوانی وەسفی کەوشەك ئەکات ئەڵێ : [١٠]

کەوشەک یاری‌یەکە لەو سەردەمەدا – تەنانەت تا ئەم سەردەمەی دواییەش – لەناو فەقی کانا زۆر باوی هەبووە ، لە ئیوارانی هەینی‌و سێ شەنبەدا خەریکی ئەو یاری‌یە بوون . وەکو (کەوشەك)ی پی ئەلین سێ بازیشی پی‌ئەلین ، سێ بازی بۆیە پی‌ئەڵێن چونکە سێ جار بازی تێ‌دا هەیە ، کەوشەکی بۆیە پی‌ئەڵێن چونکە بۆ نیشانەی بازدەکان کەوش دائەنین . . .

دوای ئەوە ماموستا سجادی ئەڵێ : ئەم یاری کەوشەکەش ئەوەیە کە چەند کەسێك کۆئەبنەوە ئەچن لەشوێنێکی راستی نەرمانی دا یەکێك لەوانە ئەبێ بە (سەرمەلا) وەیا (وەستا)جۆتێ کەوش ئەگرێ بەدەستەوە . تاکێك لە کەوشەکان لەپێشدا دائەنێ ، ئەمجا لەوێوە بازێك‌و دو بازو سێ باز ئەداو تاکەوشەکەی تر دائەنێ ، باز لەسەر قاچێك نەك دوو قاچ . . . ئەمجا یەکێکی تر بەشوێن ئەودا باز ئەدا . . . پاش ئەو یەکێکی تر ، هەر بەم جۆرە هەتا هەمو تەواو ئەبن نۆرە دێتەوە سەر وەستا دیسان لە تاکەوشی یەکەمەوەسەرەتای سێ بازەکەی دائەمەزرێنێتەوە ، ئەمجارە بازەکانی بلاوترن . تاکەوشی دووەم ئەگوێزنەوە بۆ ئەو شوێنە کە ئاخر بازی گەیشتۆتێ ، پاش ئەو ئەوانی تریش وەکو جاری یەکەم دێن . تا ئەم دوجارە سەرمەلا ئەوەندە گوێ ناداتێ ، بۆ جاری سێ‌یەم ماوەی بازەکانی گەلێ بلاوترە ، لەم جارەدا وەیا لە جاری چوارەمدا ئەوانەی کە بەشوێن ئەودا بازئەدەن یەکەم کەسیان کە بە سێ جارە بازەکەی نەیتوانی بگا بە تاکەوشی دووەم ئەوەیان ئەبێ دابێ . [١١]

هەر بەم جۆرە ماموستا سجادی وەسفی دابوونەکەش ئەکات ئەڵێ : دابوونەکەش ئەوەیە شوێنی تاکەوشی دووەم ئیتر تێك‌ئەچێ ، ئەم کابرایە کە دائەنێ بە لابەلایی ئەچەمێتەوە ، هەردو دەستی خۆی توند لەسەر هەردوو کلاوەی ئەژنۆی خۆی گیردەکات ، کابرای وەستا گوررى خۆی دەبەستێتەوە بازێك ئەدا ، تاکەوشەکە لە سەرەتای بازەکەوە رائەنرێ ، بەبێ ئەوە بوەستێتەوە و وزاقی خۆی ئەبەستیتەوە هەردو دەستی ئەخانە سەر پیشتی ئەو کەسە کە دابووە ، بازێك ئەدا بەسەریا ، قاچێکی ئەکەویتە لای سەری کابرای دابوو ، قاچێکی ئەکەویتە لای سمتی ، ئەم جۆرە بازەکەی ئەدا ، لە بازی دووەمدا گەیشتە کوێ کابرای دابوو ئەچێتە ئەو شوێنە . ئەمجا بەشوێن ئەم سەرمەلایەدا ئەوانی تریش دێن ، لەوانەیە ئەمجارە وەیا جارێکی تریش هەموویان وەکو سەرمەلا بازبدەن . کە نۆرە هاتەوە سەر سەرمەلا ئەو بەتەواوی گوری خۆی ئەبەستیتەوەو وەکوو جاری پێشوو بازئەدا بەسەر کابرای دابوودا . کابرا شوێنەکەی خۆی ئەگوێزیتەوەو ئەچێتە ئەو شوێنە . دیارە ماوە فراوانترا بووە .

لەم جارەدا هەرکەس نەیتوانی بازبدا بەسەر کابرای دابوودا ئەوا تێ‌ئەکەوێ‌و دائەبێ کابرای دابوو هەڵبەستیتەوە . ئەوەی هەستایەوە ئەبێ بەسەر وەستاو بەم چورە . . .

لە دواییەکەدا ماموستا علاءالدین ئەڵێ : ئەم یاری‌یە دیموکراتیەتیکی تەواوی تێدا هەیە . گەورەو بچوك . ماموستاو قوتابی تیایا وەك یەك وایە (واتا هەر کەس تێ‌کەوت و کورتی هێنا ئەبێ دابێ . .ح .ب)هۆنەری بەناوبانگ (خاکی)لەسەر ئەم یاری‌یە ئەڵێ .

قبول نابێ بەهیچ بابێ کە کورد دابێ لەجێ بابێ
ئەگەر سوختە مەلای جێ هێشت ، مەلا ملکەچ نەبێ نابێ

ئەە مەعلومە لای هەر کەس ،چ نادانو چ دانابێ
کە دابوون کاری نادانە ، کەسی دانا بێ ، دانابێ .[١٢]

**شێخ رەزای تالەبانی لە هۆنراوە بە ناوبانگەکەیدا کە بە (لەبیرم دێ سلیمانی کە دار الحکمی بابان بوو) دەست‌پێ‌ئەکات باسی بارودۆخی ئەو سەردەمە ئەکات دوای ئەوە ئاخ‌و ئۆف ئەکات بۆ ئەو سەردەمە ئەڵێ :**

**درێخ بۆ ئەو زەمانە ئەو دەمە ئەو عەسرە ئەو رۆژە کە مەیدانی جریدبازی لە دەوری کانی ئاسکان بوو .[١٣]**

**هەروەها پیرەمێردینەمر لە باسی بەهارو نەورۆزو کاریزی وەستا شەریف ، لە (کزەی دەروون) و زۆر لە هۆنراوەکانیا باسی چوینەتی رابواردنی ئەوسا سەرانسەر کورد یاخود بنەماڵەیەك لە کورد ئەکات . بۆ نموونە لە (دوا وانەکەی شوێن ماڵە گەورەدا)ئەڵێ :**

**ماڵە بەگزادەو سیرەی سەماوەر**
**رووی ئەو رووبارەی وا ئەگرتە بەر دەنگی نەکیساو بەزمی خوسرەوی**
**لای محمود پاشا ئەکەوتە نەوی ئاوازی سەقرو بازو باڵەبان**
**حیلەی ماینی جنسی کەحیلان ئەمانە هەمووی خوا دابوی بەجاف**
**حوکمدارێك بوون بێ لاف‌و گەزاف بۆ بازی مراد هەر قەیسەر قوومە**
**بەختم شوومەو باز کەوتە وەیشوومە**

پیرەمێرد لەم هۆنراوەیەی‌دا باسی گەرمیان‌و کوێستانی جاف یاخود ماڵە بەگزادەی جاف ئەکات لە دو ئاوانەوە ئەیگرێت کە زەلم‌و تانجەروی تێدا تێکەڵ ئەبن وەدەست لەملانی یەکترئەبن دوردەوردە لەگەڵ پێچی چەمی زەلمدا ئەروات بۆ ئەو دەشتایی‌و مێرگانەی کە جاران رێی کۆچەرانی جاف بوون . ئەو جافانەی کە ئەوبەری دەشت‌و گوێ ئاوەیان دائەپۆشی‌و لەبەر رەشماڵ هەمووی رەشی ئەکردەوە هەر خێڵەی لە شوینێکدا هەواریان ئەخست ، ئێواران ئەبوو بەهەرا ، کورگەلی خێڵ هەموو کۆئەبونەوە دەستیان ئەکرد بە یاری‌و دەمەتەقێ‌و گۆرانی ووتن . کە تاریك دائەهات ، ئاگر لەبەر دەمی هەر رەشماڵێکدا بەرز ئەبووەوە . ئنجا باسی بەزمی چاڵینان و زیرەی سەماوەرو گورانی‌و هەلپەرکێی لە دیواخانی بەگزادە دائەکات ، باسی ئەو بازو سەقرو باڵەبانانە ئەکاکە رایان ئەگرتن‌و بەخێویان ئەکردن بۆ راو . لە دواییدا هەر لەو هەلبەستەیدا ، داوا لە ئاوەکە ئەکات ئەڵێ :

توخوا ئاوەکەی بۆن گوڵاوەکە ، چۆن جامی فوتۆغراف ئەتوانێ شێوەکەی خۆی جارێکی تر دەربخاتەوە ، تۆش پیاوی چاك بە کەمێك لەو شێوەو دیمەنی رابواردنەی جارانمان پێ نیشان‌بدەرەوەو کەمێك بەو دیمەنانە ژەنگی خەم‌و خەفەتی دڵمان رامالە . . . [١٤]

ئەمەبوو هەندێك لەجۆری رابواردن‌و ئەو یاری‌و وەرزش‌و و جموجوولی کۆ مەڵایەنیەی زور لەناو کوردەواری‌دا بوو کە لە یادداشت‌و نوسینی هەندێك نوسەرەکانی بیگانەو چەند هۆنەرێکی خۆماندا کە لە هۆنراوەکانیاندا بۆی چوون . کە ئەمەش تارادەیەکی زۆر ژیانی زووی باوو باپیرانمان پیشان‌ئەداو ئەو شتانە بوون بە سامانێکی نەتەوایەتی پیروز (فولکلوری کوردی( بۆ نەوەی دوارۆژ.

**پەراوێزەکان**

١ - سەرنجێك لە دەروازەی فولکلوری کوردەوە . نەقابەی مامۆستایان لە هەولێر ل ٣٥ .
٢ - سەرچاوەی پێشوو
٣ - مەحمود مەسرەف سەرەك وەزیرانی ئەوسای سەردەمی بابانەکان بوەو وابزانم خوالێخوشبوو پیرەمێردی نەمر ئەچێتەوە سەر ئەو بنەماڵەیە .
٤ - رحلة رج في العراق سنه ١٨٢٠ . ترجمة بهاءالدين نوری ص ٦٤ - ٦٥
٥ - سەرچاوەی پێشوو ل ٧١
٦ - سەرچاوەی پێشوو ل ٧٢
٧ - عوسمان بەگ برای محمود پاشای بابانە کە میری ئەو سەردەمەی سلیمانی بوەو کوری ئەورەحمان پاشای بابانە .
٨ - الاكراد - باسل نيكتين ص ١٢٤
٩ - دوو چامەکەی نالی‌و سالم - علاءالدين سجادى . چاپخانەی مەعاریف ل ٥٩
١٠ - سەرچاوەی پێشوو ل ٦٠
١١ سەرچاوەی پێشوو ل ٦٢
١٣ - دیوانی شێخ رەزای تالەبانی . چاپخانەی مەریوانی سالی ٩٣٥ ل ٥٠ کانی ئاسکان گەرەکێکە لە گەرەکەکانی سلیمانی ، لە کاتی پێش بنیات‌نانی سلیمانی دا ، کانی‌و چەم و پێشەلان بوە ، ئاسك ئاوی لێ خواردوتەوە .
١٤ - بروانە (پیرەمیردی نەمر) . هاوار ل ١٢٤ - ١٢٧ . قەیسەرقوو ، جۆرە بانگەوازێکە لە کاتی خۆیدا لە راوا بۆ بانگ‌کردنی باز بەکارئەهێنرا .

## لەگەڵ هونەرمەند

# فائق حسن

هەریا عبداللە
وەری گێڕاوم .



هونەرمەند فایەق حەسەن بە پرسیارکردنەوە بەرەنگاری دەوروپشتەکەی بوەتەوەو بە دۆزینەوە کۆتای هاتوە .

لەسەرەتادا ئەوەی بەلایەوە گرنگ بوبێت گەیشتنی بوە بە هونەرێکی جیاواز لەنێوان جوڵانەوەی دەوروپشتێکدا کەسیمای خۆی هەیە ، کە هونەرمەند بۆی هەبوە شتێ لیێ وەربگرێو فراوانیش شتی پێبدات بۆیە ئەمەش لە ناوەرۆکی کارەکەیدا مایەوە هەروەك چۆن خۆی لەقوڵای گۆرانکاری جوڵانەوەکەیدا مایەوە .

ئەم هونەرمەندەش کە لە بەغداوە دەستی پێکردوەو لە(بوزار) لە فەرەنسا فێربوەو خواستی سەرەکی ئەوەبوە کە هونەرێك بهێنێتەکایەوە سیمای دەوروپشتو مێژووی خۆی هەبێت . . . . ، بۆیە لەراستیدا ناوبراو وێنەگرێکی ژیانی عێراق بوەو بەچاکی ناوەرۆكو گۆرانکاریو هەستەکانیو هەموو روخسارەکانی هەر لە جوڵانەوەی رۆژانەو خوونەریت هەتا بەکارهێنانی رەمز لێکداوەتەوە کە لێرەدا وەك سەودا سەرێکی ئەم ژیانە دەبینرێ کە بەشوێن نهێنییەکانیدا دەگەرێ وەك بلێی بەندەرێکی دەرونیو ویژدانییە کە تیایدا دوودڵیو گومانی شارکارەکەی ئارام دەگرێ کە دیسانەوە ئەمەش وەك بلێی دەچێتە قوڵایی هەندێ لەم بابەتانەوە کە پەیوەندییەکی قووڵو گەرمی هەبێ لەگەڵیاناو لە نێوان تیژی جوڵانەوەی کارەکانیدا دەبینین . . . ئەوەی لەکارەکانی ئەمدا نائاسایی بێ ئەوەیە کە تەعبیر لە هیچ شتێکی وەستان ناکەنو لەرەنگەکانیشدا وەستایەکی گەورەیەو نرخو بایەخی رەنگ

دەزانێ .

## هونەرو کۆمەڵ

ئەم کاروانە دورودرێژو بەکەڵکەی فایەق حەسەن رامانێ دەکێشێ بۆ ئەوەی لەبەردەمیا بپرسین :

● ئێستا گەیشتویتە کوێ ؟

● لەم چوارچێوەدا دوو مەوزوع هەن . یەکێکیان کۆمەڵایەتی‌و ئەوی کەشیان هونەری ، کە بەلای خۆمەوە زۆر گرنگە هەردوکیان پێکەوە ببەستینەوە ، یان بە واتایەکی‌تر هونەرمەند بەرامبەر بە نیشتمانەکەی ئیلتزامێکی هەیە ، کە ئەمەش یەکێکە لە پێویستی‌یەکان سەرشانی . . . هەروەها بەرامبەر بە کۆمەڵگای هونەرو ناوچە کۆمەڵایەتی‌یەکەی ، کە کۆمەڵگای هونەری‌یەکەی لێوە پەیدادەبێ دیسانەوە ئیلتزامی هەیە .

ئێستا من هەوڵ ئەدەم ئەم دوو لایەنە پێکەوە ببەستمەوە بەو هیوایەی بگەمە شێوازێك کە هەردوو لایەنەکەی تیادا بگونجێ ، بە مەرجێ خزمەتی بابەتەکانی کۆمەڵ‌و گۆڕان کاری‌یەکانی بکات‌و ئەو مانا هونەری‌یانەی لێ وەربگرێ کە ئەبێت بە بناغەی لێکدانەوەی دەستکەوتەکانی ئەو هونەرمەندە . کە لە کۆمەڵگاکەیدا پێشکەشی مرۆڤی دەکات .

لەوانەیە دەرکەوتنی ئەم حاڵەتە ئاسان‌بێ بەلام حەقیقەتەکەی گرانەو کۆششێکی گەورەی دەوێ بۆ ئەوەی هەموو داخوازی‌یەکان‌و مەبەستەکانی بهێنێتەدی .

جارێکیان بەتەنهاو جارێکیشان لەگەڵ دەستەیەك‌دا پێکەوە ئەم حاڵەتەم کردوەو لە ئەنجامدا رەچاوم کردوە کە جیاوازی‌یەکی ئاشکرا لە نێوان هەردوو حاڵەتەکەدا هەیە .

کاتێك کە هونەرمەند دەیەوێ بە تەنها حاڵەتێکی واقیعی دوور لە بنەرەتەکانی هونەر لێك‌بداتەوە کە ئەمەشی وەك حاڵەتەکانی راگەیاندن دەبێ کە ئامانجی تێ‌گەیاندنی راستەوخۆیە بەبێ‌ئەوەی ئەرکێکی زۆر لەپێناوی یەکێك لەو مەبەستانەدا بکێشێ کە نیگارکێش مەبەستی‌یەتی وەك شتە واقیعی‌یەکان هەرچەندە تەکنیکیش‌بێ کە ئەمەش هۆیەکە بۆ دروست‌کردنی وێنەکە . کە بۆ خۆی ماددەیەکەو بە دەوری روون‌کردنەوەی مەبەست لە وێنەکەدا بەپیشان‌دانی ناوەرۆك‌و روخساری هونەری هەڵئەسێ .

لە ئێستای منیش‌دا هەردوو حاڵەتەکەم وەرگرتووە هەردوو لایەکەیم کۆکردوەتەوە هەرچەندە نمونەی واقیعی زانراو لای هەموو ئاسانە بەلام لەرووی هونەری‌یەکەیەوە کەمترە ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە واقیعەت ناتوانێ زۆر لە مەرجەکانی هونەر بگرێتەخۆی . جا بەلای منەوە پاشی ماوەیەك زۆربەی خەڵکی هەست بە هۆکانی لێکدانەوەی هونەرمەند دەکات‌و ئەوەیشی کە حاشای لێ‌ناکرێ‌و راستی‌یەکی ئاشکرایەو ئەوەیە کە هیچ شتێك نی‌یە لە هەموو روویەك‌و مەیدانەکانی ژیان‌و داهێنان‌دا پێش‌بکەوێ هەروەها ماقوڵیش نی‌یە کە هونەرەکەمان لە عێراق‌دا دوا بکەوێ - کە توانیویەتی لە جیهان‌دا جێگایەك بۆ خۆی بگرێ - لەچاو هونەرە پێشکەوتوەکانی ترەوە . لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم کە شێوازێك هەبێ لێکدانەوەیەکی فراوانی تیادابێ وەك چۆن لە واقیعەت‌دا هەیەو ناسیومانە کە ئەمەش خۆمی لەسەر ئەرۆم‌و بەنیسبەت خۆمەوە گرنگە .

### (لێکدانەوەی حاڵەتێك)

● بەم چەشنە یان بە شێوەیەکی تر تۆ لێرەدا ئەرکی کۆمەڵایەتی هونەرو هونەرمەند دەخەیتەروو .

● ئەو ئەرکەی ئەمرۆ بۆ هونەرمەندی دەبینم بەتەنها بریتی‌یە لەمەسەلەی هونەری پەتی بەڵکو ئەو راستەوخۆ بەناوچەو کۆمەڵەکەیەوە بەستراوەتەوە لەگەڵ ژیانێکا کە بەرەو گۆڕانێکی ئاشکرا دەروات کە ئەگەر گەراین بەدوای کاری هونەرو ئەوانەی ئەم کارەی لێ‌دروست‌بوون دەبینین هەموویان بە کۆمەڵ‌و بزوتنەوەیدا بەستراوتەتەوە کە ناتوانین لێ‌ی جیابینەوە یان لێ‌ی دوور بکەوینەوە . چونکە هونەرمەند تاکە کەسێکی ئەم کۆمەڵەیەو لەرووی پێویستی سەرشانی‌یەوە وەکو هەموو ئەندامەکانی تری ئەم کۆمەڵە وایەو نە دورەپەرێزەو نە لێیشی بچراوە . هەروەها هونەرێکیش نی‌یە کە بە تەنهابێ چونکە من بروام بەوە نی‌یە کە دەڵێ « هونەر بۆ هونەرە» بەڵکو ئەمە تیوری‌یەکی بێ‌مانایە . . . لێرەدا دەڵێم لەوانەیە وێنەیەك بۆ خۆم دروست بکەم بەلام هەوڵ ئەدەم هەستی خەڵکی بۆ ئیشەکەم رابکێشم بۆیە لێرەدا یەکێکی‌تر لە ئیشەکەم‌دا هەیە . . . لەبەرئەوە سەرم سور دەمێنێ کە چۆن هونەرمەند بۆی دەلوێ خۆی جیابکاتەوە کە هەموو لێکدانەوەی حاڵەتێکیش پەیوەندی‌و هەوڵی تێ‌گەیشتن‌و روون‌کردنەوەیەتی .

● ئیشەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایەت بەو شێوەیە

دەشکێنەوە کە خۆت لێرەدا دووپاتیان لەسەر دەکەیتەوە .

● لەم ئیشانەی دوایمدا بایەخم بە ئەسپ داوەو تائێستاش بەردەوام لێم دەپرسن لەرووی کۆمەلایەتی یەوە مەبەستت چی یە؟ کەلکی چی یە؟ . . ئەم ئەسپە هەر لەزۆر کۆنەوە تائێستا لەگەلّ مرۆڤی عەرەبی دا پێکەوە ژیاون . چ لەکاتی شەڕەکانی دا وە چ لەژیانی ئاسایی دا . کە ئەمەش لێرەدا بۆمن ڕەمزێکی ئینسانی یەتە . منیش لە وێنەکێشانی ئەسپدا شێوەو قەلافەت و ڕەسەنی و جولانەوەکانیم پیشان داوە کە ئەمانە هەموویان لای خۆم مانایان هەیە کە ئەم مانایانەش لە هەستی خۆمەوە بەرامبەر ئەم ولاخە وەرگیراون ، چونکە من ئەم ولاخەم لە یەکێك لە حالەتەکانی دا وەرنەگرتوە بەلکو لە هەموو حالەتەکانید کە پالّ بەمرۆڤەوە دەنێ بۆ لوتکەی تێگەیشتن کە منیش لێرەدا دەمەوێ هەموو دەمو چاوەکانی حالەتێك لە نێوان ڕوانگەیەکی مرۆڤایەتی یەوە پێشکەش بکەم کەلایەنی تراژیدی تیادایە وەك چۆن لایەنە پێچەمەوانەکانی تریشی تیادایە .

● هەروەها هەمان شت بەنیسبەت گوندەوە ، چونکە وێنەی ئەو ئەسپەی لە تابلۆکانت دا دەیبینم وەکو لادێ وایە ئەگەر لەوەوە هەلّ نەقولابێ . .

● گوندی عێراقی بەلای منەوە گرنگە چونکە سەردەمێکی منالیم لە نێوان ئەندامەکانی و ناوچەکەیدا بەسەربردووە تائێستاش مرۆڤی لادێی بەشێکن لە ئیشەکانو منیش لەنێوان خاكو پەیوەندیان دا بە خاکەوە دەیان بینم و بڕوا ناکەم کە دەمو چاوێك هەبێ وەك دەمو چاوێ مرۆڤی لادێی قولّ و پڕمانابێ . . . هەموو جولانەوەیەکی مەبەستێکی تیایەو خۆم لە نێوانیانەوە نیشتمان دەبینم و بەو پێوەرەی کە ئەوان نمونەی نایابی بە پێزی خاکن . خۆمیان تیادا دەبینم .

**(هونەرمەندو ڕەنگ)**

● بەلکو تەنانەت ڕەنگ لای تۆ پەیوەندی یەکی ئەوتۆی بەناوچەی ئەو گوندەوە هەیە کە باسی دەکەیت .

● ئەگەر بەتەنها باسی ڕەنگمان کردو بەبێ ئەوەی بیبەستینەوە بەکاری هونەرمەندەوە ئەوە تەنها ڕەنگە . . کەیان کیمیاوی یە یان رووەکی یە وەیان کانەکانە (بەردو ئاوو ئاسن و مس . .هتد)

بەلام ئەگەر ویستمان لێی بکۆلینەوە ئەوا کاتێك و شیکردنەوەیەکی وردی دەوێ تا گرنگێتی بزانین . . . بەلام ئەگەر دەربارەی تایبەتی یەکانی ڕەنگ بەنیسبەت هونەرمەندەوە دواین ئەوا ئەم حالەتەیان لەوی تریان زۆر جیاوازە چونکە هەموو هونەرمەندێ حەزو هەستێکی تایبەتی خۆی هەیە بەرامبەر بەو ڕەنگانەی کە خۆشی دەوێن . . .

هەندێ لە هونەرمەندان ڕەنگی شینیان خۆش دەوێ . . بەلام برێکی تریان ڕەنگی سور یان ئەو ڕەنگانەی کە بناغەی ئیشەکەی لەسەر دەرێژێ پەسندئەکەن .

بەنیسبەت خۆمەوە بەچەند قۆناغێکی ڕەنگدا تێپەڕیوم وەك ڕەنگی سەوز شین و پرتەقالی و بە شێوەیەکی سەرەکی ڕەنگی سور . . . بەرهەمەکانی ئەو سەردەمەشم شێوەیەکی کەڕەنگ دەورێکی سەرەکی تیادا بینیون ئەمەش بەپێی بابەتەکانو ئەوڕەنگەشی کە پەسەندی دەکەم بەستراوە بەو بابەتەوەی کە چارەسەری دەکەم واتە ، بابەتی ئەو تابلۆو ناوچەیەی کە نمونەو کێشەکانی لێوە وەردەگرم پەیوەندی یەکی گەورەی بەو ڕەنگەوە هەیە کە بەکاری دەهێنم شایانی باسە ئەو ناوچەیەی کەسیمای تایبەتی خۆی هەیە ، شەخسیەت و نمونەی بابەتەکانو ڕەنگەکانی خۆی بەسەر هونەرمەندا دەسەپێنێ .

بەلام لێرەدا شتێکی تر هەیە کە جیاوازی یەکی تیادادەبینین ، ئەویش لەکاتی بەراودکردنی ناوچەکەمان لەگەلّ ناوچەیەکی وەك ڕۆژئاوادا . بۆمان دەردەکەوێت . . . وەك جیاوازی یەکی ئاشکرا بەنسبەت روناکی یەوە لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا هەیە .

وەك خۆمان دەزانین کە روناکی دەورێکی گرنگ و سەرەکی لە دارشتن ڕەنگەکانو دەست نیشان کردنی شەخسیەتی دا دەبینێ . بەتایبەتی لە ولاتی خۆماندا کە بەهۆی پرشنگی روناکی یەوە ڕەنگەکان دەردەکەون ئەمەش بە پێچەوانەی باری هونەرمەندانی ولاتانی ڕۆژئاواوەیە . هەروەها بەپێی تایبەتی یەکانی ڕەنگەکانی خاکی عێراق کە بەشێوەیەکی گشتی بەوردی لە گوندەکانیا ڕەچاوی دەکەین و لە شارە گەورەکانیشیا تەنانەت لە خانوەکانیا دەیبینین دۆخی ئاوو هەوا کاری لێ دەکات و وردە وردە شێوە خاکەکە وەردەگرێ . . .

بەوشێوەیە ڕێکەوتنێکی تەواو لە نێوان ناوچەیەك دا دەبینین کە سروشت چەند تایبەتی یەکی پێ داوە کە لە سروشتی ڕۆژئاوا جیادەکرێتەوە . . بەمەش دەمەوێ دەست نیشانی پەیوەندی ڕەنگ و خاك بکەم کە ئەمەش لە خۆڕا نەهاتوە ، بەلکو لە ئاکامی تاقی کردنەوەیەکی دورودرێژو هێزی ڕەچاوکردن دا هاتوە کە بەتەنیا بەسە بۆ ئەوەی شێوەیەکی تایبەتی لە ڕۆژهەلات دا بە

هونەرمەند بدات کە زیاتر پشت بەرەنگی تۆخ یان مامناوەندی دەبەستیٚ کە زۆر کەم لەولاٚتی رۆژئاوادا دەبینین .

سەرباری ئەمەش هەستی بەهێزی خۆم سەبارەت بە پەیوەندی خاك بەرەنگەکانەوە یان بە پێچەوانەوە پەیوەندیم بە خاکەوەو لە هەمانکاتیشدا کە تیایدا پەنجە بۆ مەزنی هەستو نەستی خۆم بەرامبەر ئەم تایبەتیٚیە دەرکەوتوەی ناوچەکەم دەکێشم .

هەروەها لەهەمانکاتدا ئەگەر رەچاوی هەندیٚ لادیٚ نشینیشمان کردبیٚ کە لە جلو بەرگیانا رەنگی بریقەدارو گوڵدار هەڵئەبژێرن ، ئەمە شتێکی ئاسایە کە سەلیقەی خۆیان بە سەریانا دەسەپێنیٚ کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کەمی رەنگی سەوزو شینو سور لەو ناوچەیەیدا کە تیایدا دەژین

● بەلاٚم بەڵگەیەکی مەعنەوی هەیە کە دوپاتی رەنگی قاوەیی دەکاتەوە .

• ئەو بەڵگە نیٚیە ، بەڵکو بونێکی راستی ئەم رەنگەیە کە پاڵم پێوە دەنیٚ کەسایەتی تابلۆکە دەربرم .

ئەگەر بێو بگەڕێینەوە سەر مرۆڤی ئەشکەوتەکان دەبینین یەکەم شتێك کە ویستویەتی بیخاتە روو وێنەی کێشاوەو گەراوە بەدوای هوی پێویستی ئەم وێنەیە کە لە ناوچەکەی خۆی دور نەکەوتوەتەوەو خاکو رووەك لە دەوروپیشتی بوەو کەرەسەکەی لیٚچنگ کەوتوە . واتە لە سوتانی ئێسقان (رەنگی سپیو لە دوکەلیش رەنگی رەش) ی چنگ کەوتوە . . . ، بەلاٚم ئەگەر بچینە قولاٚیی بیابانەکانەوەو لە شار دور بکەوینەوە ئەوا لەناو کۆچەرییەکاندا شتێکی نائاسای دەبینین بەچاو ئەوانەوەی کە باسمان کرد دەبینین رەنگەکان یەکجار سەرومرن چ لە جلو بەرگیانا وە چ لە دەوارەکانیانا کە تیایدا دەژین کە ئەوەش تایبەتیٚیە بەرەنگی قاوەییو رەشو نیلییو هەندیٚ جاریش رەنگی سور کە لە بازاری شارەکانەوە وەریدەگرن ئەوەش شتێکی ئاشکرایە کە دەوار لە مووی نیرنو تووکی حوشتر یان خوری مەڕ دروست دەکرێتو برواش ناکەم کە ئەگەر بتەویٚ لە بیابانێکا چەند رەنگێکی تیٚبئاخنیت لەگەڵیا بگونجیٚ . . . لەم حاڵەتەشدا شاز دەرئەچێت . ئێمە هەندیٚ رەنگی تاریك یان کاڵ دەبینین . بەلاٚم رەنگی قاوەییو سپی رێکەوتنێکی تەواویان لەگەڵ بیاباندا هەیە .

● لێرەدا دەمەویٚ لێت بپرسم کە ئەگەر ئەم تاقیکردنەوەیەی خاکی ناوچەو شارەزاییەت لە رەنگەکاندا لە ئەنجامی ناسیاوی خۆت لەگەڵیانا پەیدا کردوە کاتێك لە رۆژئاوابویتو ئەم پێچەوانییەت تیا بەدیکرد کە کەمێك لەمەوبەر باستکرد .

• کاتێك لە کاروانی خوێندن لە فەرەنسا گەرامەوەو چوار ساڵ لە ولاٚتی خۆمان دورکەوتبمەوە لەگەڵ ئاوو هەوای باراناویدا راهاتبوم . . . یەکەم شتێك لە ولاٚتی خۆمان لە پڕ هاتە رێگام پرشنگی روناکیو مامناوەندی رەنگەکانو بریقەیانبوو ، هەر لەو ساتەدا کە ئەم هەستەم تیا پەیداکرد بیرم لە تایبەتیٚیەکانی ئەم روناکیٚیە کردوەو لەو رەنگانە . ورد دەبومەوە کەتیایدا دەردەکەوتنو هەر لەو ساتەشدا دەستم کرد بە هەوڵدانی دۆزینەوەو لێکدانەوەی ئەم واقیعە بۆ ئەوەی لەچوارچێوەی هەوڵەکەمدا کەسایەتییەکی دەرکەوتو بە ناوچە تایبەتییەکەم بدەم .

ئەگەر بێتو بگەڕێینەوە بۆ رابورویەکی دوور . . . بۆ شارستانیتیە کۆنەکان . چەند وێنەیەکی سەر دیوارەکان دەبینین کە رەنگەکانیان لە ناوچەی ئێستامانەوە نزیکن . چونکە ئەو مرۆڤەی کە لەو شارستانییەتیەدا ژیاوە هاوبەشی تیادا کردوە هەمان مرۆڤی ئەمرۆیە کە لەگەڵیاندا دەژیو دەکەوێتە ژێر کارتیٚ کردنی روناکیو رەنگەکانییەوە . . . لەم روانگەیەوە من بڕوام بەبونی جیاوازی ئەو مرۆڤەی یەکەمو ئێستای خۆماننیٚیە ، ئەمەش بەچاوپۆشین لە جیاوازی رۆژگارو پێشکەوتنی بیرو شارستانییەت بەتایبەتی پەنەش بۆ زانست دەکێشم چونکە زانست هاوبەشی هەموو قۆناغەکانی پێشکەوتنی هونەرمەندی کردوە .

● ئایا فایەق حەسەن لە نێوان جولاٚنەوەی هونەری ئێستای عێراقدا چیدەتوانیٚ دەربارەی خۆی بڵیٚ؟

لەسەرەتادا وتم کە هونەرمەند لەنێوان ئیشەکانییەوە هەوڵی دەرخستنی کەسایەتی خۆی ئەدات . زۆر لە هونەرمەندانی هاوڕێکانم یان ئەوانەی خەریکن پیٚدەگەن بابەتەکانیان زۆر چەشنە . هەروەها شێوەی دەربڕینیشیان . ئەوەی هونەرمەند لە پێشکەوتنا وەریدەگریٚ بەستراوە بە قوڵی رۆشنبیری هونەریو تیٚگەیشتنی واقیعی هونەرییەوە . بەنیسبەت خۆمەوە هاوبەشی ئەرکی هونەری ئەو برادەرانە دەکەم . بەلاٚم لەلایەکی ترەوە کە ئەمەش هەقێکی رەوایە . بەتاقی تەنیا دەروانە کەسایەتیو تەنگو چەڵەمەی هونەری خۆم بەبیٚئەوەی ئاوڕ لەکەس بدەمەوەو لێیان وربگرم یان کارم تیٚبکەن ئەمەش واقیعی حاڵی خۆمە لەگەڵ بەشی هونەر لە عێراقی ئەمڕۆدا .

له ٢٥ نیسانی ١٧١٩ دا له لەندەن له ژێر ناوی «ژیانو سەراو دەراوە سەیرەکانی روبنسن کروسۆ ، خەڵکی یورکو زەریا گەڕ»کتێبێك چاپکرا که به قەڵەمی نووسەرێکی دیاری چاخی خۆی «دانێل دیفۆ»بوو ، له پاشانا ناوەکه کورت کراوو بووە «روبنسن کروسو Robinson Crusoe ئەم کتێبه له کتێبه سەرکەوتووو ناودارەکانی چاخی خۆی بوو . هەرچەنده خێزانێك ٣ــ٤ ڕۆژ دەژیا به نرخه گرانەکەی . بەڵام لەگەڵ ئەوەشا هەزاران دانەی لێ فرۆشرا . هەرچەنده زوربەی خەڵکی بەریتانیا هەژارو کەساس‌و نەخوێندەوار بوون . له پاشانا ئەم کتێبه بووە یەکێك له کتێبه کلاسیکی‌یەکانی ئەدەبی ئینگلیزی‌و هەموو قوتابی‌یەکان ئێستاش له قوتابخانەکانیانا ئەیخوێننەوە . له کاتی خۆی‌دا ئەم کتێبه وەك کتێبێکی ئەدەبی گەشت‌و گوزار ئەژمێردرا ، بەڵام ڕەخنەگرەکانو مێژوونووسەکانی ئەدەب به یەکەم ڕۆمان Novel ی دانا له ئەدەبی ئینگلیزی‌و ئەدەبی جیهانی دا .

دانێل دیفۆ ، یەکەم ڕۆمان نووس‌و یەکەم ڕۆژنامەگێر بوو . سەیر ترین ژیانی بردەسەرو هەموو دەم هەراو هوریایەکی زۆری له نێو خەڵکا بەرپا دەکرد بەهۆی هەڵوێست‌و بیروڕا فیکری‌و سیاسی‌و ئاینی‌یەکانی‌یەوە ، هەر هێندە بەسە بڵێین ، دیفو ، ڕۆژنامەگێرو ڕۆمان‌نووس‌و شاعیرو بازرگانو فەرمانبەرو سیاسی‌و ساختەچی‌و هەلپەرست‌و سیخور جاسوس ـو چاکەخواز ــ مصلح ی کۆمەڵایەتی‌و ئاینی بووە . وە له ڕاستی دا زۆربەی زۆری نووسەران خۆیان له باس کردنی ژیانی «دیفۆ» دوور ئەخستەوە چونکه ژیانێکی پڕ ڕووداوی سەیر سەیرو هەڵوێستی توندو تیژی تیایەو هێندە شت هەیە که وەك ئەڵقەی وون کراو دیار نی‌یە . لەگەڵ ئەوەشا ، زۆر نووسەر هەن که زۆر ڕێزو حورمەتی ئەگرن وەك فیرجینیا وۆلف که به شێوەیەکی پڕ شانازی وەك نووسەرێکی داهێنەرو خاوەن قەڵەمێکی زیندوو باسی ئەکات . بەڵام نووسەرێکی وەك دیفۆ . بۆچی بەم چەشنه ژیاوە؟ بۆچی سیخوڕی‌و ساختەچی‌یەتی توش بووە؟ لەبەر چ هۆیەك ئەم پیاوە که زیاتر له «٢٥٠»کتێبی نووسیوە ڕێگای درۆزنی‌و خوارو خێچی گرتۆته بەر؟

وا بزانم ئەگەر دیفۆ جیاواز بکرێتەوە له سەردەم ــچاخی ــی خۆی . ئەمە شتێکی ستەمە . دیفۆ له چاخێك ژیاوە که پڕ بووە له ڕووداوی ئاینی‌و سیاسی‌و ئەخلاقی ڕەش‌و تاریك‌و خوار ، و دیفۆش وەك گەورەترین ڕۆشنبیری چاخی خۆی نەیتوانیوە خۆی له ڕۆژگارو زروفی زەمانی

خۆی رزگار بکات بۆیە پێویستە تەماشای رۆژگارەکانی سەردەمی بکەین ، ئینجا بزانین دیفۆ چۆن رەفتاری ئەکرد .

دیفۆ لە سالّی (١٦٥٩-١٦٦٠) دا؟ لە دایك بووە . لە سالّی ١٦٦٠ شۆرشی ئینگلیز (١٦٤٠-١٦٦٠) کۆتایی هات لە دووای مردنی کرومویل . رژێمی مەلەکی ستیوارتی‌یەکان گەرا یەوە . لە سالّی ١٦٦٠ دا چارلزی دووەم بووە بە مەلیك ، ئەم مەلیکە ویستی پێوریتانەکان Puritans لە هەموو وەزیفەو شوێنەکی ئایینی‌و دەرکا ئەم خەلّکەی مەزهەبی پێوریتان‌و جیاوازخوازەکان «المنشقون(Dissenters) ئازار بداو بیا نچەوسێنێ تەوە ، چونکە ئەوان لایەنگیری کرۆمویل بوون‌و شۆرشیان دژی رژێمی مەلەکی بەرپا کردبوو . باوکی دانێیل «جەیمس فۆ» یەکێك بوو لە جیاوازخوازکان . پیشەی مۆم دروست کردنی بوو ، بوبێ دانێیل لە قوتابخانەکانی میری بێ‌بەش کراو زۆر ئازاری ئاینی لە ژیانیا کێشا . لە سالّی ١٦٦٥ دا نەخۆشی تاعوون لە شاری لەندەن بلاّو بۆوەو جەیمس‌و مالّ‌و مندالّی رایان کردە دەرەوەی شار تا نەخۆشی‌یەکە نەما ، ئینجا گەرانەوە لەندەن کە شارێکی ئێجگار پیس‌و دوواکەوتوو بوو لەو سەردەمەدا . لەبەر پیسی ئەم شارە هەزارەها مندالّی ساوا دەمردن ، مەی‌و مەیخانەو شوێنی هەرزان‌و کاری پیسی‌و دڕندەیی شتێکی ئاسایی بوون لە ژیانی ئەم سەردەمــــــەدا . نــــــەخۆشی خوریکە-ئاوالەPox - ئێجگار بلاّو بوو لە نێو خەلّکەکە ، دانێیل‌و باوکی لە شوێنی «سێنت گایلز ST.Giles کە پیسترین شوێن بووو پڕ بوو لە مەیخانەی هەرزان‌و پیس لە شاری لەندەن‌دا دەژیان . دوواکەوتوێی میللەتی ئینگلیز لە زۆر دیاردەی کۆمەلاّیەتی دیار ئەبێ . لەبەر ئەوەی «شەرابی جین Gin هەرزانتر بوو لە شیر بۆیێ دایکان «جین» یان ئەدا بە ساواکانیان بۆ کڕ کردنەوەیان . هەژاری‌و مەی و جیاوازی چینایەتی‌و کۆمەلاّیەتی‌و نەخوێندەواری‌و بێ ئومێدی‌و تەنگو چەلەمەی ئابووری‌و کۆمەلاّیەتی‌و رەوشت نزمی گەورەترین تاوانبارو مرۆڤی دڕندەیان دەخولّقاند ، هەروا خەلّکەکە هێندە چاوقایم بوون لایان شتێکی ئاسایی بوو کە پیاوەکی بێگانەی بێ گوناە تاکو مردن لە بەر چاوی زوربەی خەلّکەکە ئازار بدرێت . تاوانبارێك لەبەر چاوی خەلّکا دەست‌و لاق‌و لاشەی پارچە پارچە دەکراو تاکو مردن ئازار ئەدرا هەروا سەیر نەبوون زۆر کۆرپەی-بیژی-بێ گوناە لە گۆشەیەکی تارێك‌دا یاخود لە بەردەم دەرگایەك‌دا فڕێ بدرێ ، خەلّکەکە هێندە دڕندەو بێ بەزەیی بوبوون‌و هەمیشە دلّیان بە ئازاردانی مرۆڤەکی لاوازو بێ‌گوناە خۆش دەکرد یاخود بەئازاردانی گیان‌لەبەرو بالّندەکان کاتیان ئەبردەسەر .

کەواتە سادیەت Sadism ، واتە خۆشی‌و لەزەت وەرگرتن لە ئازاردانی خەلّکی تر ، زالّ بو بەسەر خەلّکەکەو ئاراستەی دەکردن . ئەم خەلّکە هێندە سەریان لێ شێوا بووو جگە لە کاری نارەواو دڕندەیی‌و مەی‌و مەیخانە چی تریان نەدەزانی .شەرم‌و حەیاو رەوشتی خاوین‌و ئابروو شەرەف هەمووی لە فەرهەنگی ئەو سەردەمەدا وون کرابون .بوێ هەموو رۆژ سەدان کاری بەبەری‌و دڕندەیی‌و سزای قورس‌و کرداری ناشیرین رووی ئەداو بەم چەشنە خەلّکەکە لە قوتابخانەیەکی تووندو تیژی‌و دڕندەیی‌و پیسی‌و نزم رەوشتی‌دا پەروەردە دەکران . جگە لەمەش ئەگەر زانیمان میری چۆن هەزارەها خەلّکی دەچەوساندەوە لەبەر جیاوازی مەزهەبی ئایینی‌یەوە ، ئینجا بۆمان دەر ئەکەوێ کە دیفۆ چۆن توانی خۆی رزگار بکا لەم بارە نالەبارەو لەم رۆژگارە بێ بەزەیی‌یە؟

لە سالّی (١٦٦٥) دا کە جێمی فو گەرایەوە بۆ لەندەن ، پیشەی خۆی گۆری ، لە جیاتی مۆم فرۆشی بوو بە قەساب ، و دەولّەمەند بوو ، لە سالّی ١٦٦٦ دا ئاگرێکی مەزن زیاتر لە نیوەی شاری لەندەنی گرتەوەو سوتاندی . جیاوازخوازەکان «المنشقون Dissenters کە بە خواپەرستی‌و مەسیحیەتی خاوێن ناویان دەرکردبوو . و دژی کلیسە ئەنگلیکانی ئینگلیز بوون وایان لێك داوە بە کە تاعوون‌و ئاگری شاری لەندەن لە خواوە هاتووە بوسەر ئەوکەسانەی کە مەسیحی‌یە راستەقینەکان دەچەوسێنەوە .

دانێیل لەبەر ئەوەی مەزهەبی ئایینی جیاواز بوو لەگەل مەزهەبی ئەنگلیکانی . بۆیێ لە تەمەنی ١٢ سالّی‌دا چووە ئامۆژگاری «ئەکادیمیەی مۆرتن» . لێرە دیفۆ زۆر شتی سوودبەخش فێربوو ، لە جیاتی ئەوەی زمانی لاتینی مردوو بخوێنێ ، زمانی ئینگلیزی‌و فەرەنسی‌و هۆلەندی‌و ئیتالی‌و ئیسپانی خوێند سەرەرای جۆرەها زانست‌و جوگرافیاو مێژوو ، باوکی دیفۆ ئارەزووی دەکرد کە کورەکەی ببێت بە پیاوێکی ئایینی‌و ئامۆژگارکا (واعظ) یێکی دلّسۆزی مەزهەبی جیاوازخوازەکان . بەلاّم دانێیل دیفۆ ئەم ئارەزووەی باوکی بە دلّ نبوو ، هەرچەندە دەمەتەق ئایینی‌و سیاسی‌و کۆمەلاّیەتی لەگەلّ خەلّکا دەکرد . لەو سەردەمەدا خەلّك بە شێوەی نامیلکە بیروراێ خۆیان بلاّو دەکردەوە . بەلاّم لەگەلّ ئەوەش‌دا چ جیاوازخوازەکان‌و چ پیاوە ئایینی‌یەکانی تر لە دیفۆ رازی بوون .

چونکە دیفۆ دوگمایەکی(dogma)–مذهب» تایبەتی خۆی هەبوو هەرچەند وەك باوکی جیـاوازخوازەکی دڵسۆز بوو ، بەڵام«تعصب»ی ئاینی نەبوو .

دیفۆ لە وەزیفەی حکومی بێبەش کرا . بۆیێ دەستی بە ئیش کردن کرد لەلەندەن دوکانەکی جل‌و بەرگ فرۆشتنی لە ساڵی ١٦٨٠ دا کردەوە . لە پاشانا لە تەمەنی ٢٤ ساڵی‌دا واتە لە ساڵی ١٦٨٤ کچێکی دەوڵەمەندی دۆزیەوە کردی بە هاوسەری کچەکە ٣٧٠٠ پاوەنی بۆ هێنا «پارەیەکی یەکجار زۆری زەمانی خۆی بوو» . ئەو هەشت ساڵەی داهاتووی ژن هێنانی دیفۆ ژیانەکی دەوڵەمەندانە ژیاو بەڵام لە ناکاوا نابوت «افلاس» بووو خۆی لە دەست ئەو کەسانە شاردەوە کە داوای قەرزیان لێ ئەکرد . بۆ چ نابووت بوو؟ کەس نازانێ . !

دیفو دەورێکی نادیاری هەبوو لەو پیلانەی کە دژی مەلیك جێمسی دووەم کرا ، چونکە شا جێمیس کاسۆلیك بووو دەیەویست ئەم دوگمایە «مذهب»دژی پرۆتستانتەکان بچەسپێنێ . بەشداربووەکان کە لە دەرچوانی ئەکادیمەی مۆرتن بوون لە سێدارە دران . بەڵام کەس نازانێ چۆن دانێیل لە سێدارەدان رزگار بوو؟ جێمیسی دووەم «شای ئینگلیز» بۆ دووەم جار ژنی هێنا کە «ماری مۆدینا maria of modena بوو ، بە هیوای ئەوەی کورێکی بێ ، بەڵام «ماریا»ژنێکی بەتەمەن گەورە بوو وە منداڵی نەدەبوو ، بەڵام قەشە کاسۆلیکیەکان کورێکیان هێنا بەهیوای ئەوەی «عەرشی ئینگلیز»بۆ کاسۆلیکیەکان بێت ، ووتیان جێمس کورێکی بوو . تا لەم سەردەمەدا جەنگی ناوخۆیی خەریك بوو بتەقێتەوە ، بەڵام (٧) پیاوی مەزنی هەردوو حیزبی ویگەکان (whigs) و تووری‌یەکان (Tories) نامەیەکیان نارد بۆ ولیامی سێیەم کە سەرۆك کۆماری هۆڵەندابوو ، و مێردی کچە گەورەی جێمس دووەم بوو» بۆ ئەوەی بێت بە شای ئینگلیز . ئێستا دیفۆ لەگەڵ خەڵکەکە چووە پێشوازی کردنی ولیامی سێیەم ، لە پاشانا خەڵکە رقیان لێ دەبۆوە ، چونکە بێگانە بووو پێیان دەووت ولیام ئۆف ئورینج William of orange یاخود Butch Billy) واتە دارە پۆلیسی هۆڵەندی» . شاعیری گەورەی ئینگلیز جۆن درایدن Dryden کتێبی «ئەناید Aneeid»ی شاعیری مەزنی «ڤێرجیل Virgil»ی ترجمەی زمانی ئینگلیزی کرد ، پارەیەکی زۆری پێ ئەدرا ، ئەگەر پێشەکی کتێبەکەی بۆ شا ولیامی سێیەم دیاری بکردایە . بەڵام درایدن بەم کارە رازی نەبوو «ئەمەش شتێکی سەیرە چونکە درایدن هەڵپەرستێکی گەورەی زەمانی خۆی بوو . مەزهەب‌و هەڵویست‌و بیروڕای سیاسی خۆی بە پێی زەمان دەگۆری» .

ئیستا هەلێکی زۆر باش بوو بۆ هەلپەرستێك وەك دانێیل دیفۆ هەڵبەستێکی درێژ بنوسێ لە ستایش کردنی ئەم شایە کە میللەتی ئینگلیز گاڵتەیان پێ دەکرد چونکە لە رەچەڵك‌دا بێگانە «هۆڵەندی» بوو . لە ٥–١١–١٦٨٨ ولیامی هۆڵەندی هاتە ئەنگلستان‌و دانێیل دیفۆی دڵسۆزی خۆی پێشان دا بە شاو پەیوەندی باش‌و دۆستایەتی لە نێوان دیفۆو شا دا پەیدابوو . لەم سەردەمەدا دانێیل دیفۆ ناوی خۆی‌گۆری «چونکە لە ئەسڵ‌دا ناوی دان فۆ بوو» ، ویستی وەك پیاوەکی «خانەدان–نیبل» و دیاری وولات خۆی دەربخا . هەروا دانێل بریاری دا کە هەمیشە «معتدل»بێت لە گشت هەڵوێستەکی سیاسی‌و ئاینی‌دا .

لە ساڵی ١٦٩٢ دا ، پاش نابووت بوون ، دیفۆ خۆی وون کردو لە ساڵی ١٦٩٤ کارگەیەکی خشت‌و کاشی کری ، هەروا لە ساڵی ١٦٩٥ بەهوی پیاوێك کەبویە ناوبژی‌کەر لە نێوان دیفۆو مەلیك ولیامی سێیەم‌دا ، وەزیفەیەکی باشی پێ دراو کرا بە «محاسب»ی لیژنەی باج وەرگرتن لە شوشەو جام ، وە لە پاشانا وەزیفەتی تری باشتری دەسکەوت ، چونکە ئامادە بوو خزمەتی شا ولیام بکات . لە ساڵی ١٧٠١ دا دیفۆ هەڵبەستێکی درێژی لە ژێر ناوی «ئینگلیززی رەسەن»دا نووسی تیایا د پی یای دەری خست کە تەنیا ولیام بێگانە نی‌یە ، بەڵکو زۆربەی زۆری میللەتی ئینگلیز بێگانەن‌و بەهۆی هێزو داگیرکردنی وولات هاتوون ، واتە ئینگلیزەکان گشتیان «ڤایکینگ‌و نۆرمان‌و سکۆت‌و پێیت Picts»ن ، سەرەتای هەڵبەستەکە بەم چەشنەیە :

لەو شوێنەی کە خوا خانووەکی نوێژکردن دروست دەکا شەیتان هەمیشە کلێسەیەکی بچوك Chapel دروست دەکا و بە تاقی کردنەوە وا دەبینرێ

کە دووەمین «شەیتان»گەورەترین تاقی نوێژکەر دەخولقێنێ .

دیفۆ خۆی شاعیرەکی رەسەن نەبوو ، بەڵام شتێکی باو بوو نووسەر شیعر بنووسێ . ئەمەش نابێ لە یاد بکەین کە دیفۆ لە رەچەڵك‌دا هۆڵەندی بوو واتە باپیرە گەورەی هۆڵەندی بوو ، بۆیێ بەرگری کردن لە شا لە هەمان کات‌دا بەرگری کردن بوو لە خۆی . بەڵام ئەم هەڵبەستە بووە هۆی ئەوەی کە دیفۆ ناوبانگی دەربخاو دەورێکی گەورە لە ژیانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی ئینگلیزدا ببینێ . بە شێوەیەك کە توانای هەبوو

«خۆپیشاندانێکی مەزن–مظاهرە» ساز بکات دژی پەرلەمانی ئینگلیزو پەسند کردنو کۆمەکردنو شا ولیام . لە سالی ١٧٠١ دا (٥)پێنج پیاوی مەزنی کەنت Kent یادگارێکیان بە شادا وداوای پارێزگاری «ئەنجومەنی گشتی – Commons» یان کرد ، ئێستا پەرلەمان فرمانیدا ئەم پێنج پیاوەی ئەنجومەنی گشتی لە بەندیخانە بخرێن . مەلیك لەم کارە ، نارازی بوو روبەرت هارلی Harley ، کە سیاسی‌یەکی مەزن بوو ، بە هاوکاری دانێیل دیفۆو ١٦ پیاوی چەکدار چوونە بەندیخانەکەو لەوێ هارلی لە بەردەم خەلکەکەدا هاواری کرد : «میللەتی ئینگلیز بەندە – عبد–ی پەرلەمان نی‌یە ، هەروا نۆکەری مەلیکیش نی‌یە» و یەکسەر ئەم پێنج سیاسی‌یە بەندکراوە بەرەللا کران ، وە لەبەر ئەم رووداوە ساماناکو سەیرە میللەتی ئینگلیز دیفۆیان زۆر خوشویستو وەك پیاوێکی دیاری شاری لەندەن حورمەتیان دەگرت ، بەلام ئەو رووداوە بووە هۆی دوژمنداری نێوان دیفۆو تووری‌یەکان Tories . بەلام لە سالی ١٧٠٢ دا ولیامی سییەم لە سواری ولاغ گلاو کۆچی دووایی کرد .

«ئان–Anne» «کە خوشکی ژنی ولیام بوو» ، بووە شاژنی ئینگلیزەکان . ئەم ئافرەتە پروتستانتی‌یە دەستی کرد بە تۆقاندنو ئازاردانی جیاوازخوازەکان . دیفۆ لە هەلوێستەکی زۆر ناخۆش‌دا بوو ، چونکە کۆنەپەرستەکان دەنگیان دژی جیاوازخوازەکان بەرز دەکرەوەو داوای دەرکردنیان لە هەموو وەزیفەو شوێنەکی گشتی دەکرد . دیفۆ کتێبێکی نوسی لە ژێر ناوی «کورنترین رێگا لەگەل جیاوازخوازەکان (The shorter way with the Dissinters تیایا دەری خست کە گالتەو تیز بە جیاواز خوازەکانەوە دەکاو هێرش دەباتە سەر مەزهەبی‌یان ، بەلام لە راستی‌دا دیفۆ راڤەی هەلوێستو بیروڕای کلێسەی ئەنگلیکانی دەکرد دژی جیاوازخوازەکان . دیفۆ ئوسلوبەکی وای بەکار دەهێنا کە بە شێوەی تیزکردنو گالتە کردنو مبالغە کردن لە بیروڕای کلێسەی ئەنگلیکانی ، خەلکەکە سەریان لێ شێوا ، نەیان زانی ئەم پیاوە دەلی‌چی . لە راستی‌دا دیفۆ بەرگری لە مەزهەبی جیاوازخوازەکان دەکرد دژی کلێسەی ئەنگلیکانی «سەرانی گرنگ : دیفۆ ناوی خۆی لە سەر کتێبەکە دەرنەخست ، خەلکەکە وایان دەزانی کە قەشەیەکی ئەنگلیکانی نووسیویەتی» . ئیتر خەلکەکە گشتیان توورە ببوون ، چونکە هەر کەسێ بە شێوەیەك بیرو راکانی دیفۆیان لێك ئەدایەوە و ئاژەلك «ضجة» و هەراو هوریایەکی زۆر پەیدا بوو لە نێو خەلکەکەدا کە زۆر حەزیان لەم چەشنە دەمەتەقی‌یە بوو . ئێستا کە زانیان دیفۆ دژی (high fliers) (ئەمانە ئەو کەسانە بوون کە داوای دەرکردنی جیاوازخوازەکانیان دەکرد لە وەزیفەو شوێنە گشتی‌یەکان) ئەم کتێبەی نووسیوە ، یەکسەر پەرلەمان فەرمانی لە بەندیخانە توند کردنی دیفۆی دەرکرد . دیفۆ خۆی شاردەوەو داوای لێبوردنی کرد لە شاژن ئان Anne بەلام بێ سوود بوو . لە تەموزی ١٧٠٣ دا حوکم درا کە دیفۆ (٣) رۆژ لە نێو «پیلوری Pillory بوەستێ «سەرنج : پیلوری تەختەدارێکە لە ملی مرۆڤ دەکرێو دوو دەستیش پێ دەبەسترێو لە گۆرەپانێکی گشتی بۆ ئەوەی خەلکەکە قورو تەماتەو هێلکەو شووتی‌و شتی تری بە سەرا فرێ بدەن» . شاژن «ئان»ئەمەی زۆر پێ خۆش بوو ، هەروا ئەو سیاسی‌یەکانی حیزبی توری Tories ، هاتنە سەیر کردنی دیفۆ لەم دیمەنە ناشیرینە ، بەم چەشنە زور بەی دوژمنانی دیفۆ ویستیان تۆلەی خۆیان لەم پیاوە بسێنن چونکە ئەو لەکتێبەکەی گالتەی پێ کردوون بەلام میللەتی ئینگلیز لە جیاتی تەماتەو هێلکە ئەکلیلی گولی جوانیان بە سەریا فرێیان دا ، چونکە لە یادیان مابوو ، چۆن دیفۆ ئازایانە چووە بەندیخانەو (٥) مرۆڤی سیاسی بەرەللا کرد لە دەست پەرلەمان لە پاشانا دیفۆ بۆ ماوەی یەك سال حوکم دراولە بەندیخانەی نیوگیت Newgate مایەوە « هەلبەستەکی درێژی نووسی دەربارەی پیلوری Pillory» . دیفۆ زۆر سوودی لە کاتی مانەوەی لە بەندیخانە وەرگرت چونکە لەگەل تاوانبارو گوناهکارو گیراوەکان دا تێکەل دەبوو ، گوێی بۆیان شل دەکردو زور شتی دەنووسی بۆ ئەوەی ببن بە کەرەستەی نووسینەکانی وەك «مۆل فلاندەرز»و «کاپتن سینگلتن»و «کولونیل جاك» هەروا زۆر شتی تر کە بوونە کەرەستەی رۆژنامەگەری دووا رۆژی .

رۆبەرت هارلی Harley ، خانەدانو سیاسی بەرزی ئینگلیز دیسان بووە ناوبژی‌کەر لە نێوان دیفۆو شاژن ئان کە قایل بوو لێی ببوورێو چ زیانی کەوتووە بیگەرێنێتەوە ، دیفۆ زۆر چاکەی هارلی بە سەرا بووو ئامادە بوو خزمەتی بکا ، بە تایبەتی بە هۆی رۆژنامەکەی «ذی رڤیو The Review» «١٧٠٤–١٧١٣» کە هەفتانە بووو لە بەندیخانەوە دیفۆ دەری ئەکرد . لە پاشانا وای لێهات ئەم رۆژنامەیە هەفتەی (٢–٣) جار دەر بچێ . هارلی‌و دیفۆ بیروڕای سیاسی‌و ئایینی‌یان جوودا بوو بەلام هەردووکیان «معتدل» بوونو تا ماوەیەك هاوکاریان لەگەل یەکا کرد لێرەدا پێویستە بووترێ کە دیفۆ بە «یەکەمین رۆژنامەنووس

دەژمێردرێت» وا زۆر بەهرەو تواناى دەرخست و گفتوگۆو دەمەتەقێ و هەموو بیروراو هەڵوێستەکى خۆى دەرخست ، هەروا زوربەى لاپەرەکانى پڕ کرد لە چیرۆك و بەسەرهاتى ژیانى واقیعى گوناهبارو تاوانبارەکانى بەندیخانە ، هەروا بڕواى وابوو ئەوەى جەماوەر بیەوێ پێویستە نووسەر وا بکات واتە وەك بازرگانێك «رۆژنامەگێرو نووسەر» پێویستە وابێ . بەڵام شتێك پێویستە بووترێ لێرە ، ئەویش ئەوەیە کە دیفۆ هەمیشە ستایشى خۆى دەکرد وەك پیاوەکى شەریف و خانەدان و سیاسى یەکى گەورەى زەمانى خۆى و نووسەرێکى تێگەیشتوو خاوەن بەهرەو توانایەکى فراوان هەروا هێرشى توندى ئەبردە سەر دوژمنەکانى خۆى و داواى لە «متعصبەکان» دەکرد کە واز لە «تعصب» بهێنن و بیرورایەکى واقعى و مەعقول و «معتدل» پەیدا بکەن ، بۆ ئەوەى ئەم زۆرانبازى یە نێو میللەت کۆتایى پێ بهێنرێ .

لەم سەردەمەدا «١٧٠٧»دا . دیفۆ دەورێکى بەرزى بینى لە یەکگرتنى هەردوو پەرلەمانى ئینگلیزى و سکوتلاندى و کتێبەکى نووسى «مێژووى یەکیەتى» باسى شتى کردو دەرى خست کە ئەم یەکێتى یە دەبێتە هۆى بە هێزى میللەت ، دیفۆ بە ناوى لادێ یەکان و بازرگانەکان و زور کەسێ تر دەرى خست کە ئەم یەکێتى یە لە بەرژەوەندى گشتى میلەتى ئینگلیزو سکوتلاندى یە دایە .

هەراو هوریاى سیاسى دیسان دەستى پێ کردوە ، چونکە عەرشى ئینگلیز نیزیك بوو چۆڵ بێت . . وە لەم کاتەدا چووە ریزى حیزبى ویگەکان Whigs و وەزیفەیەکى باشى دەسکەوت .

بەڵام لە ساڵى ١٧١٠ دا حکومەتى ویگەکان رووخاو حیزبى تۆرى Tories هاتە سەر حوکم ، دیفۆ وەك هەلپەرستێك ، هاتە ریزى ئەم حیزبەو وتى : من گوێ نادەم بە هیچ حیزبەك ، میللەت بەکێ دەنگ بدات من لەگەڵ ئەوم ، واتە ئەگەر میللەتى ئینگلیز دەنگى دا بە ویگەکان ئەوا دیفۆ لەگەڵ ئەوانا دەبێت ، و ئەگەر میللەت دەنگى دا بە تورى یەکان Tories ئەوا دیفۆ لەگەڵ تورى یەکانا دەبێ . بەڵام دەبێ ئەوەمان لە بیر نەچێ کە دیفۆ کاتێ کە ئەندام بوو لە حیزبى ویگەکان سیخورى تۆرى یەکان بوو . بۆیێ ئێستا کە هاتنە حوکم وازیان لێ هێنا . شاژن ئان Anne لە ساڵى ١٧١٤ دا مرد «شاژن ئان ١٧ مندالى هەبووو هەموویان پێش خوى کۆچیان کردبوو» بۆیێ ئێستا جۆرجى یەکەم بووە شاى ئینگلیزەکان . ئەم شایە دایکى ئینگلیز بوو ، و زمانى ئینگلیزى نەدەزانى و تێکەڵى سیاسەت نەدەبوو . لەم سەردەمەدا حیزبى ویگەکان هاتنەوە سەر حوکم ٢١ ساڵ لەسەر حوکم مانەوە . دیفۆ دیسان هاتەوە ریزى ئەم حیزبەو بووە سیخور (جاسوسى)ى حکومەت . شتێکى گرنگ هەیە کە پیویستە بووترێ ئەویش ئەوەیە کە ستیوارتى یەکان (میلەتى ئینگلیز ستیوارتى یەکانى خۆش نەدەویست چونکە بێگانە بوون لەبەر چاویا . ستیوراتى یەکان نەوەى مەلیك جیمسى یەکەم و چالزى یەکەمن کە لە کاتى شۆرشى مەزنى ئینگلیز لە ١٦٤٩ دا اعدام کرا» دەیان ویست بێنەوە سەر عەرشى ئەنگلستان . تاقێك هەبوو کە (یاعقوبى Gacobites) یان پێ دەووت ئەمانە پشتگیرى ستیوارتى یەکانیان دەکرد ، یەکێك لەمانە دیفۆ بوو .

رۆژنامەیەك هەبوو بە ناوى Mists) Journal) دیفۆ بووە یەکەم نووسەرى ئەم رۆژنامەیە ، بەڵام پاش ماوەیەك دیفۆ لەگەڵ خاوەنەکەى تێك چوو وا دەردکەوت کە دیفۆ تەلەکەبازو هەلپەرست و ترسنۆکە ، بۆیێ وازى هێنا لە سیاسەت و رۆژنامەگەرى و ئیفلاس کردەوەو خاوەن قەرزەکان یاخەیان گرت . ناچار دیسان کارگەیەکى خست و بلۆك و کاشى دامەزراند ، وە لە ساڵى ١٧٣٠ دا دیسان ئیفلاس کردەوەو خۆى شاردەوە لەگوندى گرنیچ ، لەبەر ئەوەى ژنەکى بێوەژن شکاتى لێ کردبوو لەبەر قەرزى (٢٥) ساڵ پێشوو تر .

وە لە تەنیایى دا لە نیسانى ١٧٣١ دا کۆچى دووایى کرد پاش ژیانەکى پڕ لە گەرداوەو شەپۆلى بەرزو نزمى ژیانەکى پڕ گۆران و سەخت و سەردەمێکى بێ بەزەیى پڕ لە گێژەنەى سیاسى و ئایینى .

رۆژنامەکان تەنیا هێندەیان نووسى «چەند رۆژێك لەمەوبەر دانێیل دیفۆ . ئەو نووسەرەى کە بەرهەمى زۆر بوو مرد» . بەم چەشنە ئەو پیاوە ئەنتێکەو دەربەدەرو بازرگان و خاوەن کارگەو سیخورو هەژارو دەوڵەمەندە کۆتایى بە ژیانى هێنا . بەڵام ئەم پیاوە ئێستا بە یەکەم رۆماننووس و یەکەم رۆژنامەگێر دەژمێردرێت ، هەروا خاوەن عەقڵێکى قوول و فیکرێکى رووناك و چاکەخواز (مصلح) یَکى کۆمەڵایەتى ئەژمێردرێ . دیفۆ ،خوێ خەریك دەکرد بە نووسین و خوێندن و هەولى ئەدا لەگەڵ واقیع دا بگونجێ و خۆى پیاوەکى خانەدان و سیاسى یەکى دیارى زەمانى خۆى بێ . بۆیێ هەمیشە تێکەڵى هەموو دیاردە سیاسى و ئایینى یەکانى زەمانى خۆى دەبوو . واقیع بەتفت وتاڵى و کۆسپەوە سەرچاوەى نووسینەکانیەتى ، بۆیێ دیفۆ هەمیشە لەگەڵ ژیانى چاخى خۆى دا ئەگونجاو دەمەتەقێ لەگەڵ هەموو پارتى و تاقە سیاسى و

ئایینی‌یەکانی دەکرد هەروا لەم سەردەمەدا زۆر هەول ئەدرا بۆ ئەوەی زانستی عەمەلی‌و تیوری (نظری) ڕێك بخرێ بۆئەوەی زانست‌و ئەدەب‌و هونەر زیاتر گەشە بکەن . کابرایەك کتێبەکی نووسی‌و تیایا باسی کرد کە نووسەری چاك ئەو کەسەیە بە ئاسانترین ڕێگاو کورتترین ڕستەو ڕەوانترین زمان بیروڕای خۆی دەرئەخا . بۆیە دەبینین بایەخ دان بە ووشەی قورس‌و ڕستەی نادیار باوی نەماو ئوسلوبی ڕۆژنامەگەری سادەو ڕەوان و زمانی ئاسان‌و ڕێك‌و پێکی ڕستە زۆر بایەخی پێ درا .

ئەمەش بووە هۆی پەیدا بوونی جۆرێك لە چیرۆك کە پێیان دەووت رومانسی R;mance ، دیفۆ زۆربەی بەرهەمی ئەدەبی بەجێ هێشت لەمانە :

١ – تارمایی خاتوو ڤیل Mrs. Bcal (١٧٠٦) چیرۆکێکی خەیاڵی

٢ – ڕۆبنسن کرۆسۆ ١٧١٩

٣ – کابتن سینگلتن Singleton (١٧٢٠)

٤ – یادگارەکانی سوارەك ١٧٢٠

٥ – مۆل فلاندەرز (١٧٢٢) (ڕۆمانەکی درێژە) .

٦ – کۆلۆنیل جاك Jack ئەمە دەربارەی منداڵێکە لە خێزانەکی خانەدان بەڵام لە منداڵی‌یەوە لەلایەن جەردەزەریایەك (قرصان)ەوە پەروەردە دەکرێت .

٧ – لاپەرەکانی ساڵی تاعوون ١٧٢٤ «ئەمە سەیرترین چیروکی ساڵی تاعوون (١٦٠٥)ە ، مرۆڤ لەبەر کارەساتی خەڵك پێ دەکەنێ» .

٨ ووتارێك دەربارەی پرۆژەکان .

ئەمەش کتێبێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی‌و ئابووری‌یە . لە کتێبەدا دیفۆ داوای کرد قانوونی چاك دابنرێ بۆ بانقەکان‌و تأمین‌و ڕێگاوبانی باش‌و قیرتاو کراو بکرێت‌و باج لە دەسکەوت «ضريبة الدخل» وەربگیرێ‌و نەخۆشخانەی سێیەکان بکرێتەوە هەروا پێویستە ئافرەت و وەك پیاو بخوێنێ‌و بێتە مەیدانی کارکردن ، هەروا داوای یەکسانی‌و دۆزینەوەی کار بۆ هەموو کەس ، هەروا دیفۆ لە کتێبەکەی‌دا کورتترین ڕێگا بۆ دەوڵەمەند بوونی دیارخست «بەڵام دیفۆ (١٣)جار ئیفلاس کرد لە ژیانی» . بە ڕاستی هوشیاری و عەقلیەتی نایابی‌و ڕۆشنبیری قوولی دیفۆو تاقی‌و تەجروبەی لە ژیانی گشتی ئینگلیز هێندە بەنرخن‌و لە کتێبەکانی کە ژمارەیان دەگاتە (٢٥٠) کتێب دەرئەکەون ، بۆیە ئەم نووسەرە کلاسیکی‌یە شوێنەکی دیاری هەیە لە مێژووی ئەدەبی ئینگلیزدا .

ڕۆمانی ڕۆبنسن کرۆسۆ ١٧١٩ کە یەکەم ڕۆمانە لە جیهاندا ، یەکسەر بووە هۆی ئەوەی کە دیفۆ ناوداریتی مەزن پەیدا بکا ، وە سەرکەوتوانە ناوی تۆمار کرد لە ئەدەبی جیهاندا ، ویەکسەر ترجمەی فەرەنسی کرا . ئەم ڕۆمانە گەش‌و بەرزە زۆر مەرجی هونەری تیا بەدی دەکرێ وەك کەراکتەری وپلوت «حبکە Plot» ورووداو زۆرانبازی مۆنۆلۆژو زمانی پەخشانی سادەو دەربڕینی هەست‌و نەستی مرۆڤ دەربارەی جیهان‌و ژیان‌و کۆمەڵگاو گەردوون . . بەڵێ کرۆسۆ «ئەم کەراکتەرە ئیشکەرو زیندوو ئازاو کارامەو خاوەن عەقلەکی قوول‌و هەستی مرۆڤانە» زاڵ بوو بەسەر داهێنەرە (دیفۆ) کەی ، بۆیە ، دیفۆ لە شەپۆلی ناوی ڕۆبنسن‌دا ناوی وون بوو . بەڵام تاکی‌و تەجروبەو خۆشی‌و تفت‌و تاڵی ژیانی کرۆسۆ لە دیفۆ جوودا ناکرێت ، واتە ئەم ڕۆمانە لە ئۆتۆبایوگرافی «سیرە ذاتیة Autobiography» دەچێ ، ونووسەرەکەی کە دایناوە دەزانێ کتێبەکەی «ئەدەبی گەشتیار – أدب الرحلات»ی داناوە کە زۆر باو بوو لەو سەردەمەدا ، بەڵام ڕەخنەگران ئەمەیان بە یەکەم ڕۆمان دانا ، هەروەها مۆل فلاندەرز کە چیرۆکەکی درێژە «٣٠٠ لاپەرە زیاترە» دەربارەی تەنگوچەڵەمەی ئافرەتێك لە زەمانێکی سەخت‌و پڕ ناکۆکی‌و دڕندەیی‌و چۆن ئەم ئافرەتە هەوڵ ئەدا بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات لە چنگ ئەو بارو زروفە ناخۆشانەی کە دووچاری بوون .

لە سەردەمی دیفۆدا زۆر چەشنە بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکرایەوە وەك «ڕۆژانە – یومیات»ی قدیس ئۆگستین ، هەروا زۆر چەشنە کتێبی ئەدەبی گەشتیاری کە باسی ژیانی میللەتی دوورەکانی دەکرد بڵاو دەکرایەوە ، بۆیە دیفۆ کتێبی ڕۆبنسن کرۆسۆی نووسی بۆ ئەوەی وەك نووسەرانی تر ناوی خۆی دەربخا ، بەڵام لە ڕاستی‌دا پیاوێك هەبوو ناوی ئەلکسەندەر سەلکیرك Al.Salkirk بوو و بەدرێژایی چوار ساڵ لە دورگەی جوان فیرناندیز Fernandez بە تەنیایی ژیا ، ریفۆش چیرۆکی ئەم پیاوەی گۆری‌و بە ئوسلوبەکی ڕازاندراوەو زمانەکی ڕوون‌و ئاسان توانی پەیوەندی ئەم پیاوە بە خوای خۆی دەربخا و هەست‌و نەستی تەنیایی مرۆڤ دەربخا . کرۆسۆ خۆی ڕزگار دەکا لە مردن کاتێ کە پاپۆرەکەیان لە گەرداوەیەکی مەزنی زەریا پارچە پارچە ئەبێ . کرۆسۆ بە هۆی کە لەکێك زۆر شتی سوود بەخش لەگەڵ خۆیا دەهێنێ . دووایی کرۆسۆ دەکەوێتە دەست جەردە زەریایی‌یەکان (القراصنة) و بە شێوەیەکی بەربەری‌و دڕندانە لەگەڵیا ڕەفتار ئەکەن ، دیفۆ زۆر ئاخ‌و داخی بەربەرەکانی ژیانی خویا لەگەڵ خەڵکا دەر ئەخا . بەڵام خودا

کرۆسۆی ئارام گر ڕزگار ئەکا تا دەگاتە دورگەیەکی دوورو بۆ ماوەیەکی درێژ بە تەنیایی دەژی . لێرە ئەو مرۆڤە هەموو جۆرە کارێك فێر دەبێ . تارتاشی ، جلك درووی‌و ئاژەڵ بەخێر کردن ، چاندنی برنج‌و جۆ ، و زۆر شتی تر بۆ ئەوەی ژیانی لەم تەنگوچەڵەمەیەدا ئاسان ببێت . گرنگترین خاڵ لێرە پەیوەندی کرۆسۆ لەگەڵ خوای خۆیەتی ، بۆیێ کرۆسۆ – یاخود دیفۆ – لەگەڵ خۆی بەراورد دەکا ، قوولایی عەقل و هەست‌و بیروڕاو هەڵوێستی‌و تاقی ژیانی بەکار دێنی‌و سوود لە زۆر ڕووداوو کتێب وەك «اعترافاتی قدیس ئۆگستین» وەر ئەگرێ .

ئەو خوایەی کە کرۆسۆی ڕزگار کرد لە دەست جەردەو زەریادزەکانی «القراصنة»و کاری درەندەیی‌یان ، ئەو خوایەی کە هەموو شتی پێویستی ژیانی ئاسان کرد توانای هەیە لەم تەنگوچەلەمەیە ڕزگاری بکا . ئەم تفتی‌و تاقی ژیان‌و تەنگوچەڵەمەی ژیان چۆن کار ئەکەن بەسەذ عەقڵ‌و هەستی مرۆڤ‌و ئاراستەی دەکەن لە ژیانا ؟ دیفۆ بە شێوەیەکی دراماتیکی توندو تیژ ئەم ڕەفتارانەی کرۆسۆ دەر ئەخاو بیروڕاکانی پیورتیانەکان‌و جیاوازخوازەکان «کە خۆیان بە مەسیحی ڕاستەقینە دادەنا» دەرئەبڕی . کرۆسۆ هەمیشە وەك مرۆڤەکی داهێنەرو خاوەن عەقلێکی قوول‌و دانایەکی چالاك‌و ئازا دەرئەکەوێ . «لێرە دیفۆ ستایشی‌و زاتی خۆی دەکا» . دەربارەی کرۆسۆو کەرەکتەرەکانی کولرج دەڵێ : «هەرکەس دەتوانێ خۆی لە جیاتی کرۆسۆ دانێ» واتە کرۆسۆ ڕەمزێکە بۆ گشت مروڤانی تەواوی ئەم جیهانەو جۆری تیفکرین‌و ڕەفتاری لە تەنیایی‌دا ئازادی‌و سەرفرازی گشت مرۆڤایەتی ئەنوێنێ . چونکە هەموو مرۆڤێك

کە ڕووبەڕووی سەختی‌و پەشێوی ژیان بوو ، ئەوا لە تاقی‌و تەجروبەیەکی ژیانا تێپەڕ ئەبێ‌و دەربارەی دیاردەکانی ژیان خورەوشتی دەرئەخا . وە لە ڕاستی‌دا ژیانی کرۆسۆ ژیانەکی ئایینی‌و خواپەرستی‌و کرداری چاکی مرۆڤە ، لە تەنیایی‌دا تەنیا خوا هۆگری دەروونی مرۆڤە . وە لە ڕاستی‌دا بیروڕا ئایینی‌یەکانی کرۆسۆ – یاخود دیفۆ – لە کتێبی «حورمەتی ئایینی Religious Courtship » دا دەرئەکەوێ . خواپەرستی لەگەڵ سۆزو انفعالاتی ناخی مرۆڤ تێکەڵ دەبن‌و حەسانەوەو دڵ ڕەحەتی بە مرۆڤ دەبەخشن . واتە مرۆڤ بە انفعالات ڕەفتار دەکا لەگەڵ ڕووداوە مەزنەکانی جیهان وەك مردن‌و ڕزگار بوون ، بۆیێ ژیانی زاهیدی‌و تقشف چەند هەستەکی ئارام گری‌و دڵفراوانی بە مرۆڤ دەبەخشێ .

ئافرەت سەرنجی دیفۆی ڕاکێشاوە ، وە بیروڕاکانی لایەنگیری مافی ئافرەت دەکا ، بۆیێ ئافرەت شوێنەکی تایبەتی هەیە لە بەرهەمی دا .

ڕۆگزانا Roxana (١٧٢٤) یەکێکە لەو چیرۆکانە کە دەربارەی ئافرەتێکی جوان ئەدوێ . ئەم ئافرەتە پاش (١٥) ساڵ شووکردنی‌و پاش پێنج منداڵ لە مێردەکەی بڕیار ئەدا. لە کۆیلەتی «عبودیة» خێزانی ڕا بکا . دیفۆ دەیەوێ ئەوەمان بۆ دەربخا کە زروف‌و ڕۆژگاری پیس ڕەفتاری ئافرەت بەرەو خراپە دەگۆڕێ ئەمەش بە جوانترین شێوە لە ڕۆمانی مۆل فلاندەرز Moll Flander (١٧٢٢) دەرئەکەوێ . ئەم ڕۆمانە درێژە ڕۆمانێکی ڕاستەقینەیەو دەربارەی ئافرەتێکی کە دیفۆ لە بەندیخانەدا پێشوازی کرد . دیفۆ لە پێشەکی دەرئەخا کە ئەمە چیرۆکی واقیعی تفت‌وتاڵی ئافرەتێکە وتەنیا خۆی کورتی

کردۆتەوەو بە ئوسلوبی ئەدەبی خۆی نووسیویەتی . ئەمە خەباتی تاکە ئافرەتێکە دژی جیهانەکی پڕ لە ناکۆکی‌و قەساوەت‌و درندەیی‌و بێ‌ڕەوشتی . زەمینەو مەناخی کۆمەلایەتی چۆن کار ئەکەنە سەر ڕەفتاری مرۆڤی تاك ؟ ئەم ڕۆمانە وەلامی ئەم پرسیارەمان ئەداتێ . دیفۆ بەزەیی دێت بە گوناهکارو تاوانبارەکانی ، هەست‌و نەستی خوێنەر ئەبزوێ کاتێ کە مۆڵ Moll دەبینێ دزی دەکا ، ئیشی خراپ دەکا ، شت دەرفێنێ‌و خراپ ترین کار بەجێ دێنێ ، بەڵام بەزەیی خوێنەر هەمیشە زیاد دەکا کە دەبینێ چۆن ڕۆژگاری کۆمەلایەتی تەئسیرەکی زۆری هەیە بەسەر ڕەفتاری ئەم ئافرەتە . ژیانی هەژاری‌و درندەیی‌و نزم ڕەوشتی کۆمەڵگای ئینگلیزی بە ڕاسترین شێوە بەدی ئەکرێ لەم ڕۆمانەدا . کۆلن ویلسن دەڵێ : ' دیفۆ ئەم ڕۆمانەی نەنووسیوە بەڵکو دزیویەتی . بەڵام دیفۆ ئوسلوبی ئەدەبی خۆی بەکار هێناوە بۆ گێڕانەوەی چیرۆکەکە . لە کۆتایی ئەم ڕۆمانە درێژەدا مۆڵ ئافرەتێکی تۆبەکار دەبێ‌و مێردەکەشی کە چەتەو ڕێگر بوو تۆبە دەکاو بە کامەرانی‌و هێمنی دەژین . بەم چەشنە ئەم ئافرەتە کە خۆی هاویشتە ناو زەلکاوی ژیان ، و لە نزمترین ڕەوشتا ژیا ، توانی خۆی ڕزگار بکاو ڕابوردووی پڕ لە پەژارەو کەساسی‌و داوێن‌پیسی لە یاد ببات . وولتر ئەلن W.Allen دەڵێت مۆل فلاندەرز ڕۆمانێکی سوسیولوجی‌یە چونکە تأسیری کۆمەڵگا دەرئەخا بەسەر مرۆڤ‌و چۆن تاوانبار دەخولقێ لە ناوچە (بیئة) یەکی ناسازو نزم ڕەوشت‌دا .

موڵ لە منالی‌یەوە بەندیخانە لەدایك بووە . دایك‌و باوکی خۆی نابینێ‌و نازانێ منالەتی چۆن بووە . تەنیا کە گەورە دەبێ دەزانێ دایکی ٣ پارچە قوماشی دزیو .

مۆل لەگەڵ قەرەجەکانا ژیاو لە پاشانا هاتە شاری کلۆچێتەر Clochester . مۆل لە ماڵی موختاری شار ژیاو فێری دروومان بوو . لە پاشانا چووە ماڵەکی تر وەك ئافرەتێکی خزمەتکار ئیشی کرد . لێرە مۆل فێری مۆسیقا بوو چونکە ماڵەکە دەوڵەمەند بوو و مامۆستای تایبەتی منالەکانی ئەم ماڵەی فێری زۆر شت ئەکرد «مۆسیقاو سەماو زمانی فەرەنسی» فێر بوو . ئەم خێزانە دوو کوڕیان هەبوو . کوڕە گەورەکەیان پەیوەندی توندی بەست بە نهێنی لەگەڵ مۆل‌دا ، کە زۆر قەشەنگ و جوان بوو . بەڵام ئەم کوڕە گەورەیە واز لە مۆل دەهێنی‌و برا بچوکەکەی «رۆبین Robin» مۆلی دەهێنێ . مۆل هەموو پەیوەندی جینسی پچڕاند لەگەڵ برا گەورەکەی مێردی چونکە ئەم پیاوە لە مانای شەرەف‌و عەدالەت‌و مەسیحیەت ناگات . مۆل دوو منالی دەبێت لە مێردەکەی رۆبین . پاش پێنج ساڵی کامەرانی رۆبین Robin مردو دوو منداڵەکەی دایك‌و باوکی رۆبین بردیان ، بەم چەشنە مۆل لە دوو منداڵەکەی بێ بەش کرا . مۆل تۆزێك دەوڵەمەند بوو بەهۆی میراتی مێردی ، بۆیێ ژوورەکی بە کرێ گرت لە ماڵی کوتاڵ فرۆشێك کە لەگەڵ خوشکی خۆی‌دا دەژیا . مۆل دووبارە مێرد دەکا بە کوتاڵ فرۆشەکی ترو پارەکەی ئەدا بە مێردی کە خێرا ئیفلاس دەکاو داوا لە مۆل دەکا کە هەندێك شت بشارێتەوە لە جێگایەك‌و مێردەکەی را دەکا بۆ فەرەنسا . بەم چەشنە مۆل دەکەوێتە داوی تێفکرینی دەربارەی پیاوەکانی کۆمەڵگاو سایکۆلۆجیانە دەروونیان شیتەل ئەکاتەوەو ئەوەی دەرئەخا کە پیسن ، بۆگەن‌و تەماع کارن‌و لە قسەی پیس‌و مەی‌و رەفتاری هەرزان چی تر نازانن . هەروا زیرەکانە لەوە ئەگات کە ئافرەت ماف نی‌یەو وەك شتێك دەکڕی‌و دەفرۆشرێ . تێ دەفکرێ : ئایا پیاوەکی بەشەرەف هەیە شووی پێ بکا ؟ . بەڵام خەڵکەکە دووای پارەو پول‌و ژنی هەرزان وێڵن . بۆیێ مۆل تیز دەکا لە پیاوان‌و گاڵتە بە خەڵکەکەی زەمانی خۆی ئەکا کاتێ کە لەگەڵ بیۆژنێك‌دا دەژی راستە ئافرەتەکان بە دووای پیاوان‌دا دەگەڕێن بەڵام پیاوەکانیش ئافرەتیان ناوێ ، بەڵکو پارەو خشل‌و زێڕیان دەوێ . مۆل بۆ سێیەم جار شوو بە پیاوێك دەکاو لەگەڵیا دەچێت بۆ ڤیرجینیا «وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا» . ئەم پیاوە ئەرزو دەغل‌و دانی هەبوو لەوێ . لێرە دایکی مێردەکەی چیرۆکی بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە بۆ مۆل‌و مۆلیش واق ووڕ دەمێنێ چونکە یەکسەر بۆی دەرئەکەوێ کە ئەم ژنە دایکی مۆلەو مێردەکەی مۆلیش زڕبرایەتی . مۆل لە خۆی‌و لە ژیانی بێزار ئەبێ .

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا مۆل خۆی بێ‌دەنگ دەکا وەك ژن‌و مێرد ژیانی ئەباتە سەر لەگەڵ زڕبراکەی‌دا بۆ ماوەی (٣) ساڵ‌و منالەکی لێ نابێ . ئەم راستەقینەیە سامدارە ژیانی مۆل تاڵ‌و تاریك دەکات بۆیێ مۆل هەموو شت بۆ دایکی دەگێڕێتەوە . دایکی مۆل داوای لێ دەکا بێ‌دەنگ بی‌و نهێنی ژیانیان کپ بکاتەوەو لەگەڵ «براکەی» وەك ژن‌و مێرد بژی . بەڵام مۆل توانای نامێنی لەبەر دەم راستی تفت‌و تاڵ بۆیێ بۆ «براکەی» یاخود مێردەکەی بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە ، ئەویش سەر سام‌و بەترس هێمن دەبێتەوەو شەرمەزار دەبێ لە ژیانی بۆیێ دەچێتە ژوورەك‌و دەیەوێ بە پەتێك خۆی بخنکێنێ بەڵام دایکی‌و بە یارمەتی پیاوەکی زنجی ئەم پیاوە رزگار دەکەن ، پاش (٨) ساڵ لە ڤرجینیا (ئەمەریکا) مۆل دەگەڕێتەوە ئەنگلستان . مۆل لەگەڵ ئافرەتێك ژیاو شووی کرد بە پیاوەکی چاکی دەوڵەمەند و (٣) منداڵی بوو (دووانیان مردن) بەڵام پاش (٦) ساڵ لە ژیانی‌دا لەگەڵ ئەم پیاوە دوور کەوتەوە .

مۆل پەیوەندی بەستبوو لەگەڵ فەرمانبەرێکی بانق ، ئەم پیاوە ژنەکەی خۆی تەلاق ئەداو داوا لە مۆل دەکا شووی پێ بکا ، بەڵام مۆل گەشتێك ئەکا بۆ «لانکشایەر»و «لیڤەرپوول»و شوو دەکا بە پیاوەکی دەوڵەمەند «ئەمەش پێنجەم مێردە لە ژیانی‌دا» . مۆل لەگەڵ ژنێك سەفەر دەکا ژنەکە دەچێتە ماڵی برای‌و مۆلیش شوو ئەکا بەم کابرایە . بەڵام وا دەرئەکەوێ ئافرەتەکە – کەوا دەستە خوشکی مۆلە – هیچ براو خوشکی نی‌یە بەڵام خۆی داوێن پیسە ، هەروا دەرکەوت ئەم پیاوە دەوڵەمەندیش نی‌یە بەڵکو چەتەو ڕێگرێکەو ناوی «جەیمس James»ە . جەیمس داوای لێبوردن دەکا لە مۆل‌و خۆی بزر ئەکا . مۆل دەگەڕێتەوە شاری لەندەن‌و چاوەڕێ دەکا منالی ببی‌و مێردی پێنجەمیشی جەیمس دەچێتە ئێرلەندە . مامانێك سەرپەرشتی مندال بوونی مۆل دەکا . بەڵام ئەم مامانە وەك ئافرەتێکی داوێن‌پیس دەرئەکەوێ «زوربەی کەراکتەرەکانی ئەم رۆمانە بێ‌ناون‌و لە ژیانەکی پیس‌و هەرزانا دەژین» . مۆل منداڵەکی دەبی‌و (١٠) پاوەن ئەدا بە ژنێك بۆ ئەوەی منداڵەکەی بۆ بەخێو بکا ئەویش لەبەر ئەوەی دەیەوێ دیسان شوو بکا بە فەرمانبەرەکەی (بانق) . کاتێ کە مۆل‌و مێردەکەی (فەرمانبەری بانق) لە خان (Inn) ێك‌دا دەژین (٣) پیاوی جەردە پەلاماری خانەکە ئەدەن «یەکیان جەیمس

- مێردی مۆل - ئەبێ» بەڵام جەیمس مۆل نابینێ. مۆل (٥) ساڵ ژیا لەگەڵ مێردەکەی فەرمانبەری بانق، بەڵام ئەم مێردەش مرد لەبەر ئەوەی زۆر خەفەتی خوارد دووای سووتانی قەرزێکی گەورەی لە لای پیاوێکدا. ئێستا مۆل تەمەنی (٤٨) ساڵ بوو و چەندەها منداڵی لەم لاو لەولا فرێ درابوون و دەستی کرد بە دزی‌کردن‌و شت فراندن. رۆژێك مناڵەکی بچووکی جوان دەبینێ، مۆل ملوانکە زێڕەکەی ئەدزێ‌و دەیەوێ منداڵەکە بخنکێنێ، بەڵام ئەم ئارەزووە شەیتانیەی نایەتە جێ. لەگەڵ چەند ئافرەتی داوێن‌پیس تاقەکی جەردەیی‌و دزی کردن دائەمەزرێنن. ئەوەی ئەم کردارانەی بکردایە حوکمی أعدام کردنی بەسەرا ئەدرا. زۆر ژن‌و پیاو تووشی لەسێ‌دارە دان ئەبن‌و اعدام ئەکرێن. مۆل دەبێتە تەلەکەبازو دزو جەردەو دەست دەکا بە یاری قومار لەگەڵ پیاوانا. بەڵام پاش دزی‌و شت رفاندن مۆل دەکەوێتە دەست پۆلیس‌و لە بەندیخانەی نیوگەیت Newgate بەند ئەکرێ‌و حوکمی اعدامی پێ ئەدرێ. رۆژێك (٣) پیاوی جەردە دەهێنرێن بۆ ئەم بەندیخانەیە - یەکیان لەمانە جەیمسی چەتەو مێردی مۆل دەبێ - مۆل دەموچاوی پۆشی‌و شاهیدی دژی جێمسی مێردی دا. قەشە یەك توانای هەبوو حوکمی اعدام کردنی جەیمس‌و مۆل بگۆرێ. مۆل رەوانەی ڤیرجینیا - ئەمەریکا - دەکرێ‌و لەسەر پاپۆرەکە مۆل‌و جەیمس دیسانەوە بە یەك دەگەن. مۆل لە ڤیرجینیا دەچێتە لای زربراکەی (کە مێردی بوو بۆ ماوەی (٨) ساڵ) و سەیری کورەکەی خۆی کە لە زربراکەی بوو دەکاو ناوی هەمفری دەنێ.

مۆل دەزانێ کە دایکی مردووە، مۆل هیچ قسەیەکی نەکرد لەگەڵ زربراکەی (کە مێردی بوو) بۆیێ چووە ویلایەتێکی تری ئەمەریکاو دەستیان کرد بە چاندنی توتن. مۆل نامەیەکی بۆ براکەی دەنووسی بەڵام پاش ماوەیەك، هەمفری(کوری مۆل‌و زربراکەی) دێتە لای مۆل‌و ماچی دەکا. هەمفری مۆل دەبات بۆ ماڵیان‌و پارچەیەك زەوی - دایکی مۆل - ئەدرێ بە مۆل‌و مێردەکەی جەیمس تۆبە دەکاو ژیانەکەی ئایینی‌و مەسیحیەتی راست دەژی. مۆل‌و جەیمس زۆر دڵشاد دەبن لە ئەمەریکاو پاش (١٠) ساڵ لە نەفی‌خانە «واتە لە ئەمەریکا» دەگەرێنەوە بەریتانیاو بەم چەشنە مۆل پیر دەبێ. وچیرۆکەکە دووایی دێت.

بەم چەشنە دەبینین کە رۆژگارو ناوچەی پیسی کۆمەلایەتی دەورێکی بەرزیان هەبوو لە ئاراستە کردنی مۆل‌و رەفتارە پیس‌و هەرزانەکانی، مۆل توانای نەبوو لەم پەژارەو کەساسی‌یە خۆی رزگار بکا بەڵکو زوو دەکەوتە چاڵی ژیانی گومرایی‌و هەرزان، چەندەها منداڵی لەم لاو ئەولا بەجێ مان، و زۆر جار ئیشی خراپەکاری دەکرد لەگەڵ پیاوو ئافرەتانی زەمانی خۆی. بەڵام ئەو کەسانەی دیفاع لە مافی ئافرەت دەکەن مۆل فلاندەرز بە قدیسەك دادەنێن.

**چەند سەرنجێك :**

١ -جیاوازخوازەکان «المنشقون Dissenters» ئەمانە تاقێکی ئایینی بوون دژی کڵێسەی ئەنگلیکانی ئینگلیز.

٢ - پیورتانەکان Puritans ئەمانەش تاقێکی تر بوون دژی کڵێسە ئەنگلیکانی ئینگلیز. ئەم دوو تاقە لە ژێر سەرکردایەتی کرۆمویل‌دا شۆرشێکیان داگیرساند دژی مەلیکی ئینگلیزی (١٦٤٠ - ١٦٦٠) بەڵام لە ساڵی ١٦٦٠ ستیوارتی‌یەکان هاتنەوە سەر عەرشی ئینگلیز.

٣ - ویگەکان Wh;gs : تاقێکی ناوەندی ئینگلیز بوون لە پاشانا بوون بە پارتی سەربەستەکان «حزب الاحرار».

٤ - توریەکان Tories : ئەمانە پارتێکی سیاسی لایەنگیری رژێمی مەلیکی ئینگلیز بوون «کونەپارێز - محافظ»ن‌و بوونە پارتی کونەپارێزی - حزب المحافظین - ئێستا.

**سەرچاوەکان :**


1 - A History of English Literafure by : Emile Legours and Lois Cazamian (1967)

2 - Encylopedia Brittanica. 1975.

3 - Moll Flanders: by Daniel Defoe. Pan Book X 433 London 1965

«کۆلن ویلسن پێشەکی‌یەکی درێژی بۆ نووسیوە»

4 - The English Novel: By Walter Allen. 1967.

5 - Aspects of Novel: by E.M.Forster.1963.

6 - Ashort History of English Literature: By Sir Ifor Evans 1963.

7 - The Story of Mankind: By Hendrik Willen Van Loon.

ئەم کتێبە دەربارەی مێژووی جیهانەو بە سەدان جار چاپ کراوە لە چاپی (Poket Book) (١٣) هەم ١٩٤٥.

٨ - مجلة الاصوات. العدد الثالث ١٩٦١ السنة الاولى (طبعة لندن) مقال بعنوان «دانیال دیفۆ» بقلم سهیل بدیع بشروئی.

# نیگارکێش و هونەرمەندی فەرەنسی "پۆل سیزان"

ئامادەکردنی :
● هەژار عەزیز سورمێ ●

لەراستیدا هونەر بریتی نیە لە گواستنەوەیەکی بێگیانی وشك برینە بەڵکو داهێنانێکی سەربەخۆی زیندوە کە رێگایەکی راست دەگرێتەبەر . بەمشێوەیە دەگەینە بێشکەی رێگای بزوتنەوەی ئایندەی هونەری نوێ وە لە «تەکعیبیە» تەوە بگرە تاکو «ئەلبوت ئارت» . گومانی تێدانیە ئەم راستیانەیش لە هونەرمەندێکی وەك «پۆل سیزان»مان نزیك دەکاتەوە وەوامان لێ‌دەکات کە لەلایەنەکانی تری بکۆڵینەوە لەبەرئەوە حەزمانکرد کە کورتەیەك لە ژیانی باس‌بکەین :-

سیزان لە ١٩ی ئاداری ساڵی ١٨٣٩ز بۆ یەکەمین جار لە شاری ئیکسن بروفنس (Aixen – Provence)[1] چاوی بەدونیا هەڵێناوە .

ئەوەی کاری لە سیزان کرد . کە خولیای هونەری بکەوێتەسەر ئەو شارەبوو کەتێ‌یدا لە دایك‌بوو ، وە تاکو کۆتایی ژیانشی بە دەوری دووشاری سەرەکی دەسورایەوە . یەکەمیان ئیکس‌و دەوروبەری‌و ئەوی‌تریان باریس‌و دەوروبەری .

باوکی (لویس أوجست سیزان) مرۆڤێکی دەوڵەمەندبوو جگە لەوەی کە «بانك» ێکیشی هەبوو تادەهات سامانەکەی زیادی دەکرد و بەمجۆرە گەیشتە ریزی چینە بۆرژواکان بەتایبەتی دوای سەرهەڵدانی شۆرشی فەرەنسا سیزان توانی بۆ یەکەمین جار قۆناخی فێربوونی یەکەمی لە قوتابخانەی «سان جوزیف» تەواوبکات . لە پاشان بۆ دواناوەندی گشتی‌و دوایی بۆ کۆلیجی بۆربون (Collge. Bourbon) . بەلام لەوکاتەدا بایەخێکی زۆری بە زانیاری ئایینی ئادەمیزادی ئەدا وە بۆیەکەمین جار زیرەکی خۆی لە بیرکاری‌و زمانی لاتینی‌و یۆنانی دەرخست وە شیعریشی بە لاتینی‌و فەرەنسی نووسیوە .

له دوادوای ساڵی ١٨٥٨دا تاقی‌کردنەوەی وەزاری دایەوە بەڵام تیایا سەرنەکەوت ، له پاشان لەسەر فەرمانی باوکی چووە کۆلیجی یاسا هەرچەندە له دڵەوەیش پیی‌خۆش نەبوو ، بەرپەرچی ئەم فرمانەی ئەدایەوە ، بە هەرحاڵ دوو ساڵ لەم کۆلیجەدا مایەوەو له ماوەی ئەم دوو ساڵەدا چەندین نامەی بۆ هاوریٚ بچکۆلانەکەی ئەمیل زولا (Emile Zolla) نووسی کەتیایا ناگوزەرانی ژیانو ناخۆشی جێگای بۆ باس‌دەکرد . سیزان لەسەرەتای لاوێتدا چەندەها شیعری بەسۆزی نووسیوە هەروەکو جارێکیان «ئەمیل زولا» ی هاوریٚ بچکۆلانەکەی له نامەیەکدا بۆی نووسیبوو ( ئەتۆ شیعر دەنوسی بەڵام شیعری من روونو پاکترە له شیعری تۆ ، گەرچی شیعری تۆ زیاتر هەستو سۆزیو شاعیرێتی تێدا بەدی دەکریٚ چونکە تۆ له قوڵایی دەرونەوە ئەنووسیو من لەژێری خۆمەوە) ، له دواییدا باوکی رازی‌بوو کە خوێندنی یاسا بەجیٚ بهێڵیو . رووبکاتە باریس بۆ خوێندنی هونەرەجوانەکان ، دوای ماوەیەکی کەم له نووسینگەی باوکی دامەزرا . له ساڵی ١٨٦٢ز بۆ جارێکی‌تر گەرایەوە باریس‌و هەشت ساڵی رەبەق مایەوەو چاوی بە زۆر شاری ترەوە شادبوو . باوکی بەتوندی لەگەڵی دەجوڵایەوە ئەم توندو تیژی‌یە بەسەریدا بیوەهۆی ئەوەی کە نەی‌ئەتوانی له سنوری خۆی تیٚپەرکات تا خۆی له خۆیدا مرۆڤێکی‌تر دروست بکات ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا سەربەخۆیی هەبوو له بەرێوەبردنی ژیانی‌دا .

لەتەمەنی سی ساڵی‌دا پەیوەندیەکی بەتینی لەگەڵ ئافرەتێك بەست کە ناوی . هوڤتینس فیکۆ .[٢] (Hovtense Fiquet) بوو ، باوکی ئافرەتەکە فەرمانبەرێکی بچووك‌بوو له یەکێك له بانکەکان .

سیزانو هوفتن بەیەکتری شادبوون هەرچەندە له باوکی ئەترساو نەی‌ئەوێرا بیدرکێنیٚ ئەم ترسەش دەگەرێتەوە سەر بەهێزی باوکی‌و پشت‌بەستن بە یارمەتی ماددی باوکی وە ئەم نەدرکاندنەش هەروا مایەوە تاکو چەند ساڵێکی تری له تەمەنی‌دا بەری‌کرد .

له ٢ی ئەیلولی ١٨٧٠ فەرەنسا بریاری جەنگی لەگەڵ بروسیادا ، لەبەرئەوە بریاردرا کە لاوەکان بۆ ـنگ بیرێن .لەمکاتەدا سیزان خۆی‌و ژنەکەی رایان‌کرد ی «لوستاك»[٣] دوای کۆتایی شەر جارێک ـ گەرانەوە با یس‌و دوای گەرانەوە کورێکیان‌بوو ناویان نا پول (Paul) سیزان له یەکەمین شیعری‌داو ئەو دەسکردە هونەریانەی کە لەسەرەتادا نەخشاندبوونی له هونەرمەندی‌و زانایەتی دەرکەوت وە له سیفەتەکانی تری مرۆڤێکی تابلیٚ‌ی شەرمین‌و بەئارام ، زور تێنووی هونەربوو بە شێوەیەك کە باسی ناکریٚ . زور تابلۆی له پێشانگاکانی جیهانی فرۆشراوە . لەمانە «منداڵێك بە جلی سورەوەو کە له ساڵی ١٩٥٨ بە نرخی ٦١٦٫٠٠٠ دولار وە «ماڵێك –له بروفنس «کە له ساڵی ١٩٦٥ بە نرخی ٨٠٠٫٠٠٠ دولار فروشراوون .

سیزانی هونەرمەندو زاناو شاعیر له هەمویان زیاتر له «کلودمونیە» و «اوجست رینوار» وە نزیك‌بوو .

له ساڵی ١٨٧٢ زایینی لەگەڵ خێزانەکەی‌دا بۆ شاری پونتوا (Pontoise) کۆچیان کرد کە هونەرمەندی بەرزو مەزن «کامیل بیسارۆ»ی لیٚ نیشتەجیٚ‌بوو . بیسارۆ لەگەڵ سیزان بەدەوری شارەکەدا ئەسورانەوە بۆ وەرگرتنی ئەو دیمەنە رازاوانە بۆ ئەوەی لەسەر لاپەرەکانیان بینەخشێنن . نیگاری هەردووکیان یەك جور بوو وە دیمەنە سروشتیەکان بوونە پیشەنگی دەروونی سیزان .

هەربۆیەش بوو کە گرنگیەکی زۆری پی‌ئەدا . بیسارۆ زۆری ریز له سیزان دەناو تاکو کۆتایی ژیانی «بیسارۆ» بە ماموٚستای ئەو دەژمێررا . یەکێك له لایەنە هونەریەکانی ئەم هونەرمەندە : گرنگیەکی زۆری بە «پورتریت» ئەدا چەند وێنەیەکی یە پۆرتریت کێشاوە لەوانە هی ژنو خوشکەکەی .

له ساڵی ١٨٩٠ز دوابروا بە زاناو زیرەکی سیزان هێنرا . ئەم زاناو شاعیرو هونەرمەندە تاکو دوا هەناسەی ژیانی زۆر بە جۆشەوە کاری‌کردووەو هەمیشە گەڵ‌و پەلەکانی لەسەر شان‌بوو .

لەرێکەوتی ٢٢ ی ١٠ی ١٩٠٦ کۆچی‌دوایی کرد دوای‌ئەوەی کە بەردی بناغەی بۆ هونەری نویٚ‌ی ئەمرۆمان دانا . دوای ئەویش «بیکاسۆ» ئەو دەوری ئەگێرا کە سیزان لەسەری رۆیشتبوو .

١ (Aixen – Provence) : شارێکی بچکۆلانەیە چەند خولەکێك له (دەریای سپی ناوەراست»ەوە دوورە .

٢ ئەم ئافرەتە له شارێکی بچکۆلانە دەژیا له رۆژهەلاتی فەرەنسا .

٣ – لوستاك : مینایەکی بچووکی راوکەرانە لەسەر دەریای سپی ناوەراست .

سەرچاوە : بە دەستکاریەکی زورەوە له گۆڤاری «الدوحة» ی عەرەبیەوە –



# گیاندار لە چیرۆکی منداڵاندا

●گرنگترین شتێ کە منداڵ لەقوتابخانەدا فێری دەبێ ئەوەیە : چۆن ڕێگایەکی دروست لەژیاندا بگرێ. ئەو بابەتانەی لەقوتابخانەدا فێر دەکرێن تەنیا هۆن بۆ ئەم مەبەستە ، هۆنبۆ فێرکردنی خوێندنەوەو نووسین ، چراو ڕێگا بۆ منالاًن ڕووناك ئەکەنەوە . .

فێربوون بەکەڵکی چی دێت ، ئەگەر منداڵ وەرس بکات ، خوێندنەوەی لەلا خۆشەویست نەکات ، قوتابخانەی لەلا پیرۆز نەکات؟؟

ئەم پرسیارە ، پرسیارێکی ڕەوای تر دێنێتە پێشەوە : مامۆستا چۆن دەتوانێ والە منداڵ بکات ، بەتاسەوە ڕووبکاتە خوێندنەوەی چیرۆکێك ، یان سەرگوزشتەیەك کەپێوەندی بەگیاندارەوە هەبێ ، چۆن مامۆستا دەتوانێ والە منداڵ بکات چێژ لەناوەڕۆکی ئەو چیرۆك‌و سەرگوزشتەیە وەربگرێ‌و لەلای ببێت بە بەشێك لە کارە پەروەردەییەکە؟

با تۆزێ لەئاستی بەشی یەکەمی پرسیارەکە بوەستین‌و بزانین چۆن خوێندنەوەی چیرۆك لەدڵی منداڵا خۆشەویست دەکرێ ، چونکە منداڵ‌و چیرۆك پێوەندیەکی تەواویان لەنێوانیاندا هەیە .

**هاندانی منداڵ بۆخوێندنەوە :**

کە ڕێیان دەکەوێتە ـتابخانەیەك‌و دەچینە پۆلێکەوە ، تەماشا دەکەین لەنێو قوتابیەکاندا ، جیاوازی‌یەکی زۆر لەم مەیدانانەدا هەیە : توانای خوێندنەوە ، نووسین ، دەربڕین ، لەبەرکردن ، قسەکردن . . .و تەنانەت دەستوخەت!



گۆڕینو ئامادەکردنی : سرگول محمدأمین

لەخۆمان دەپرسین : هۆی ئەم جیاوازی‌یە چی‌یە؟
بۆمان دەرکەوێ ، یەکەم هۆ دەگەڕێتەوە بۆژیانی منداڵ لەنێو هەردوو دەوروبەرە سایکولوژی‌و سوسیولوژی‌یەکە . رادەی مانەوەو سوڕانەوەو هەڵسوکەوتی لەچوارچێوەی ئەودوو دەوروبەرەدا . ئەمە جگە لەپێوەندی منداڵ بەماڵ ، بەقوتابخانەو بەکۆمەڵەوە .

**ماڵ** : دایك‌و باوك لەماڵدان . یەکەم کارتێکردن وهەربناخەی بۆ سەر منداڵ لێرەوە دەست پێ دەکات . لە یەکەم قۆناخی منداڵیێ‌دا «۳–۷»ساڵ منداڵ ، یەك‌پارچە عەوداڵی ناسین‌و پرسیارکردنە دەربارەی ئەو شتانەی دەیانبنێ ، یاریان پێ‌دەکات ، ئەو شتانەی بەخەیاڵی‌دا تێ‌دەپەڕن . بەپێ داگرتنەوە داوا لە دایك‌و باوك وکەسوکاری دەکات کە باٹاشکراو دروستی وەڵامی پرسیارەکانی بدەنەوە . زۆرجار منداڵ پرسیاری نارەحەت‌و سەرسوڕهێنەر دەکات ، یان جاری واهەیە دایك‌و باوك شەرم دەکەن وەڵام بدەنەوە لەوپرسیارانە : براکەم یان خوشکەکەم لەکوێوە هاتوون ، کێ خودای دروست کردووە ، خودا لەکوێ‌یە؟ ئەگەر منداڵ وەڵامی بەجێ نەدرێتەوە تووشی گۆشەگیری‌و بێ دەنگی دەبێ‌و شەرمنۆك دەردەچێ . ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە لە ژیانی منداڵ‌دا ، کرانەوەیە بۆ رووبەروو بوونەوەی کۆمەڵ‌و قوتابخانەو ژیان .

**کۆمەڵ** : هاوڕێ ، دۆست ، یاریگا ، یانە ، گەشتوگوزار ، جادەو بازاڕ دەگرێتەوە . . منداڵ بەشێك لەکاتی خۆی–کەم یان زۆر–لە کۆمەڵ‌دا بەسەر دەبات‌و هەڵسوکەوتی لەگەڵ هاوڕێ‌و هاوتەمەنەکانی خۆی‌دا دەبێت . بۆیە مەودایەکی فراوان لەکۆمەڵ‌دا دەبینێ بۆ بەکارهێنانی مەبەستەکانی بێ ئەوەی

چاودێرێکی ئەوتۆی بەسەرەوە بێت . ئەگەر کۆمەڵو دەوروبەر باش بن ، ئەوا منداڵ لەماڵەوە تووشی ناکۆکیو دژواری نابێت . بگرە زیاتر بەتەربێتو رەوشت پاك دەبێ . خۆ ئەگەر کۆمەڵو ماڵ دووربن لەیەكو جیاوازی زۆریان لەنێواندا بێ ، ئەوا ئەو منداڵە دەکەوێتە بەردەم تەوژمی رەشەبای گۆرانو . . . زیاتر روو لەسەرکێش دەکات . ئەمەش زیانێکی گەورەیە لەگوڵی باخچەی نیشتمان دەکەوێ .

قوتابخانە : ئەنجامی دایكو باوك وکۆمەڵە ، لێرەدا مامۆستا شوێنی کەسوکارو قوتابخانە شوێنی کۆمەڵ دەگرنەوە . تێکەڵ بوونی ئاوەرۆی هەرسێ (کەسوکار ، کۆمەڵو ، قوتابخانە) کەسێتی منداڵ دروست دەکات .بۆیە کە منداڵ لەماڵەوە—کەیاریو گەمەی تیادا زاڵە— دەچێ بۆ قوتابخانە —کەزیاتر کارکردن تیایدا زاڵە—پێویستە لەسەر کەسوکار ، ئەو منداڵە ئامادەبکەن بۆ گوێگرتن لە مامۆستاکەی .یارمەتی بدەن کە هەندێ سەرگوزشتەو ووردە بابەتی منداڵانەی فێربکەن وپێی لەبەربکەن ، تاکو مەودای بیرکردنەوەی فراوانتربێ ، توانای وەرگرتنی بنیات بنرێ ، چاوو رووی بکرێتەوەو ببێت بەشتێکی سوودمەند بۆیو لەژیانی نێو کۆمەڵدا پشتی پێبەستێ . منداڵ بەم تەرحە بروا بەخۆی پەیدا دەکات بۆپێشەوە دەرواتو وەختێ دەچێتە قوتابخانە ناشڵەژێ ، تووشی سەرلێ شێوان نابێت . ئەگەر کەسوکار بتوانن منداڵەکەیان لە قوتابی ماڵەوە بکەن بەقوتابی قوتابخانە ، ئەوا رێگا بۆ مامۆستا خۆش دەکەن سەرپەرشتی بنیاتنانی کەسێتی منداڵەکە بکاتو قاڵی بکاتەوەو گورو هێزی بخاتە بەر . ئەمە جگەلەوەی نابێ کۆمەڵە بارو دۆخێك لەبیربکەین کە دەوریان زۆرە لەهاندانی منداڵ بۆخوێندنەوە وەك : باری خێزانداری ماڵەکە ، تەندروستی منداڵەکە ، کەسێتی مامۆستاکەو . . .هتد .

ئەمە ئەگەر توانیمان هەموو کۆسپەکان تەختبکەین . دەمێنێتەوە سەر ئەوی ، بابەتی چیرۆکەکە بەلەزەت بێ ، باڵبەسەر دڵوگیانی منداڵەکەدا بکێشێت .

نووسین بۆمنداڵ : نووسین بۆ منداڵ شتێکی سووكو ئاسان نییە چونکە تێگەیشتن لەهەستی منداڵ ، لەئارەزووی منداڵ ، لەخەیاڵی منداڵ ، لە لێکدانەوەی منداڵ قورسو گرانە . حاڵیحازر زانایانی مەیدانەکانی زانستی دەروونناسی وکۆمەڵناسی روویان کردۆتە منداڵو لێکۆڵینەوەی منداڵ بۆ ئەوەی بگەنە رادەیەك بتوانن هەستونەستی منداڵ بناسن ، ئەو رێگایانە دەستنیشان بکەن کە کاریان تێ دەکات . هەموو زاناکان رایان وایە یەکەم قۆناغی منداڵێتی سەختترین وقورسترین قۆناغە لەمەیدانی پەروەردەدا .

ئەمەش دەگەرێتەوە بۆئەو جوداوازییەی لەنێوان عەقلییەتی گەورەو منداڵا هەیە . لەم قۆناغەدا هەردوو لایەنی گەورەو منداڵ هەوڵ دەدەن ئارەزووەکانی خۆیان بسەپێنن ، تاوێ بەهێمنیو تاوێکیدی بەتوندی . دیارە مەبەست لە هەردوو رێگاکەش — هێمنی وتوندی— دەستگرتنی منداڵەو رێ نیشاندانێتی . جا بۆ ئەوەی کاریپەروەردەیی رێگایەکی راست بگرێتەبەر ، زاناکان چەند وێستگەیەکیان داهێناوە بۆ دەستگرتنو یارمەتیدانی منداڵ تاقۆناغی منداڵێتی بەسەرکەوتوویی ببرێ .لەم وێستگانەش : فیلم ، وێنە ،ئەویاریانەی زاخاوی مێشك دەدەن . هەموو ئەم وێستگانەش لەپێناوی نەشونماکردنی بیری منداڵە .

لەسەرووی ئەم وێستگانەوەش چیرۆك هەیە—جا بەوێنەوەبێ یان بێوێنە—کە کاکڵەو رۆحی ئەدەبی منداڵ پێك دێنێ . کە گەلێ نووسەر ، هاتنە ئەم مەیدانەوەو گەلێ بڵاوەخانەو دەزگایبڵاوکردنەوەش بەدەنگی ئەم بانگەوازەوە هاتن ، تائەدەبی منداڵ وای لێهات بوو بەلایەنێکی داهێنانی ئەدەبی ، . . بۆیە نووسین بۆمنداڵ بە پەراوێزێکی لاوەکی کاری داهێنانی ئەدەبی ناژمێرێ ، بگرە لایەنێکی داهێنانەو هەموو سیمایەکی داهێنانی پێیە . هەر بۆیەش گەلێك نووسەری ناسراو روویان کردە ئەم مەیدانەو بەشدارییەکی مەردانەیان لەم بوارەدا کردووە .

چیرۆك چاترین هۆیە : لەو روانگەیەوە کە چیرۆكو کورتە چیرۆك لە رۆژی ئەمرۆماندا بالاترین دەور دەبینێ لە دروستکردن وشتومالکردنی زەین لە لای گەورە بەگشتیو لەلای زاروك بەتایبەتی ، چونکە بەدڵو بەگیان لە گەڵ چیرۆکەکەدا تێکەڵ دەبن ، ئەگەر بێتو دەرگای دڵیان بکاتەوەو ختوکەی خەیاڵیان بدات . جانووسەر لەپەنای چیرۆکەکەیەوە دوو شتی مەبەستە . یەکەم : زمانەوانی ، دووەم : زانیاری

مەبەستی زمانەوانی خۆی لە «دارشتن ، دەربرینو رستەکاندا»دەنوێنێ ، دیارە ئەم لایەنەش شوێنێکی گرنگ لەبنیاتنانی زمانپاراوی منداڵ دەگرێتەوە ، رەوانیو دروستی زمانیش بناخەیەکی بەهێزە بۆ ئەوەی منداڵ کۆشکی زانیاری خۆی لەپاشە رۆژدا لەسەر بنیات بنێ .

جا گرێدانی هەردوولایەنی (زمانەوانی + زانیاری) بەیەکترەوە ، سەرکەوتنی چیرۆکەکە دەر دەخاتو ئەنجام

دەداتەدەستەوە ، چونکە چیرۆکەکە بەسێ قۆناغ دا تێ‌دەرپەڕێ : قۆناغی یەکەم بەستراوە بەنووسەرەوە ، کەشتەکەی دەخاتە بازارەوە ، قۆناغی دووەم بەستراوە بەمنداڵەکەوە کە شتەکە دەقۆزێتەوە ،قۆناغی سێهەم بەستراوە بەزمانو دارشتنو چۆنێتی چیرۆکەکەوە . . کە ئەمیان هەردووك نووسەرو منداڵ لێك نزیك دەخاتەوەو پێکیانەوە دەبەستێ .

**کەسێتی گیاندار** :چیرۆکی منداڵان ،زیاتر پشت بەگیاندارو باڵندەو کەسایەتیو جوڵەو ئەتواری ئەمانە دەبەستێ . مەبەستیش رێ نیشاندانو فێرکردنو خۆشی بەخشینە بەمنداڵ . لەکۆنیش‌دا ئەمە هەبووە ، وەکو لە کتێبی کلیلەو دەمنەدا دەبینرێ ، بەڵام ئەو چیرۆکانە راستەو راست بەگوێرەی سروشتی گیاندارەکان نووسراون لە هەموو ئەم رووانەوە : هەڵسوکەوت ، جوڵانەوە ، توندو تیژی ، هێزو توانا ، زیرەکی ، گەمژەیی . .هتد بەهیچ جۆرێ سروشتی ئادەمیان بەسەردا نەسەپێنراوە .

ئەمەش یەکێکە لەو خاڵە لاوازانەی لەچیرۆکی منداڵانەی ئەمرۆدا هەیە . پێم‌وایە کەم نووسەر دەرکیان بەمە کردبێ . خۆ زۆریان هەرکەوتونەتە هەڵەوە . باچیرۆکی «ئەو کەرەی خەونی بەباڵەوەی دی»ی ایوب منصور بۆ نموونە وەربگرین وسەرنجێکی بدەینو بزانین تاچ رادەیەك ئامانجی پێکاوە .
لەرووی زانیاری‌یەوە : پاڵەوانی چیرۆکەکە کەرێکە ، نووسەر هاتووە ئەقڵی پێ‌بەخشیوە تاخەون بدینێ . باڵی لێ رواندووە بۆ ئەوەی بەجیهان‌دا بگەرێ تاژنێکی شایان بەخۆی بدۆزێتەوە .

ئاشکرایە هەوڵی ئەم چیرۆکە سەرنەکەوتووە ، نووسەر رەوشتێکی مرۆڤانەی بەسەر گیاندارێك‌دا سەپاندووە کە «کەرە» گەمژەیی سیفەتی زاڵی‌کەرە ، تەنانەت خەڵکی ئەگەر کەسێك زیاد لەپێویست گەوج بێ وەکو تانووت پێ‌ی دەڵێن : کەر . ئەمە بەرێژەی کەسێتی کەرەوە ، خۆ خەونو خەیاڵش لەهەموو گیانداران‌دا بەشی مرۆڤە ، رەنگە سووکە بیرکردنەوەو ژیری لەلای هەندێ گیاندار هەبن ، بەڵام لەلای کەر هەرنی‌یە ، خۆ باڵ رواندن بۆکەر خوازەیەکی نابەجێ‌یە بۆیە ئەم بابەتە چیرۆکانە بۆ منداڵ دەست نادەن ، بەهەڵەیان‌دا دەبەن ، زیانیان لەسوودیان پترە ، راستە رێگای بیرکردنەوە لەمنداڵ دەشێوێنن . بۆیە دەبوو چیرۆك نووس لەبری کەر گیاندارێکی تری بەکار هێنابا ، باریوی هەڵبژاردایە کە بەزیرەکیو فێڵبازی ناسراوە . ئەمە جگەلەوەی گەلێك گیاندار هەن پێشەکی خەسێتو سیمای ناسراویان هەیەوە بەزۆری لەچیرۆکی منداڵان‌دا بەکارهێنراوە بۆ نموونە : سەگ بەوەفاداری ودڵسۆزی ، پشیلە بەسپڵەیی ، مەیموون بەلاسایی کردنەوە ، کەر بەگەوجێتی ، رێوی بەزیرەکی وفێڵ ، گورك بە درندەیی ناسراوون .

نووسەر هەر هێندەی لەسەرە ئەم خەسێتو سیمایانە لەشوێنی راستەقینەی خۆی‌دا بەکار بێنێ .

بانموونەیەکی تر تەماشابکەین «مەیموون وشەپقە فرۆش» :
شەپقە فرۆشێ ، بۆپشوودان ، لەسێبەری دارێکا لا دەدات . تۆزێ دەخەوێ ، کەهەڵدەستێ ، شەپقەکان نەماوون . دەروانێتە ئەم لاولای خۆی ، هیچ نادینێ ، سەرهەڵ دەبرێ . سەیردەکات چەند مەیموونێ ، لەسەردارەکەنو سەروشەپقەیان لەسەرناوە ، بۆ ئەوەی شەپقەکانی چنگ بکەوێتەوە . شەپقەکەی خۆی تێ‌دەگرێتن ، ئەوانیش شەپقەکانی خۆیانی تێ‌دەگرنەوە .

ئەم چیرۆکە سەرکەوتووە ، پاڵەوان مەیموونە . مەیمون بەلاسایی کردنەوە ناسراوە ، بۆیە کردارەکەیان پێچەوانەی رەوشتی خۆیان نەبوو ، ئەمەجگە لەوەی پیاوەکەش شەپقەکانی بەشێوەیەك وەرگرتەوە کە قەناعەت لەلای منداڵ دروست دەکات . نووسەر توانیویەتی مەیموونو ئەتواری مەیموون لەجێ‌ی خۆی‌دا بەکاربێنێ .ئەگەر پاڵەوانی ئەم چیرۆکە جگە لەمەیموون هەرگیاندارێکی تربوایە سەرکەوتوو نەدەبوو . چونکە لاسایی‌کردنەوە سیمای تایبەتیو زاڵی مەیمونەو بەس .

**واقیع و خەیاڵ** :نووسەرانی چیرۆکی منداڵ بۆیە زیاتر پشت بە گیانداران دەبەستن . چونکە نزیکن لە خەیاڵی منداڵەوە . منداڵ وای دێت بەخایاڵ‌دا ، ئەوانیش زمانیان هەیە . وەکو ئەم قسەدەکەن .بەڵام ئەم رێڕەوە ئەگەر بەدروستیو لەشوێنی خۆی‌دا بەکار نەیەت زیانی لەقازانجی زیاتر دەبێ‌و منداڵ بەرەو جیهانێکی خورافیو دوور لەواقیع دەبات .

لە کۆتاییدا ، مەبەست لەچیرۆکی منداڵ ، زیادکردنی توانای فیکری منداڵ ێ ، ئاراستەکردنی بێ ، ناساندنی بێت بەجیهانێکی نوێ‌و نزیك لەخۆیەوە کەجیهانی گیاندارە . ئەوا چیرۆکی ریالزمیو جیهانی هەست‌پێ‌کراوو لەبەردەست . زانیاری زیاتری پێ دەبەخشێ ، تواناو بەهرەی پتری پێ‌دەدات‌و وای‌لێ دەکات لەسەر زەمینەیەکی برایتە بوەستێ‌و دووربێ لە واهیمەو خەیالات . ئەگەر پەناش برایە بەرگیانداران با بەشێوەیەکی لاوەکی بێت‌و سووکە هەوێنێ بێت بۆ مەیاندنی سەرتاپای چیرۆکەکە

**تێبینی** : بڕوانە : الموقف الادبی ژمارە «١٠١»ئەیلولی ١٩٧٩

# میرنشینی ئەرتەقی لە دیاربەکر ١٠٢٢ - ١٤٠٩ ی زایین

رۆشنبیری نوێ
وەری گێراوە

ناوچەی جزیرەی فورات[1] بەپێی ئەو شوێنەی کە هەیبووەو هەیەتی و کە وای لێ کردوە لە شەرو ئاشتی دا ناوچەی پەیوەندی کردنو کارتێك کردن بێ لەنێوان جیهانی ئیسلامی و گەلانی تردا ، ئەم ناوچەیە مەیدانێکی بەپیتو پێزی چەندین لێکۆڵینەوەیە کە ئەو دەورە روونبکەنەوە کە ناوچەکە لە بەرەوپێش چوونی رووداوەکان و پەرەسەندنی شارستانی دا گێراویەتی .

بایەخی ناوچەیە بەهۆی جموجۆڵی تیرەو خێڵە گەورەکانی وەك دەیلەمو غەزو سەلجوقی و خوارزمی و تەتەرەوە لە ناوەراستی ئاسیاوە بەرەو رۆژئاوا رۆژ بەرۆژ لە برەو پتربوون دا بووەو ناوچەی جزیرە لەمەوە بووە بە نیشانو ئامانجی هێرشی لەشکری ئەو تیرەو خێلانەو لە ئەنجام دا گۆرانی فراوانی سیاسی و شارستانی بەسەر ناوچەکەدا هاتووە . کاتێك جەنگی خاچ پەرستان بەرپابوو ناوچەی جزیرە لەبەر ئەو مەڵبەندە ستراتیجەی هەیبوو کە بەسەر عیراقو شام دا دەیروانی ، بوو بە یەکەم نیشانو ئامانجی خاچپەرستانو توانیان کە یەکێك لە میرنشینەکانیان لە ناوچەکەدا دابمەزرێنن و ئنجا جزیرە کەوتە بەردەم ئەرکو ئۆباڵی سەرشانی

رووبەروو بوونی خاچپەرستەکان .

جگە لەمە ناوچەی جزیرە توانای زۆرو زەبەندەی ئابووری و مەڵبەندێکی نایابی هەبوو بووبوونە مایەی ئەوەی کە لەگەڵ لایەنەکانی دراوسێ دا تێکەڵ بێ و دەزگا بەرێوەبەری و سیستەمی حوکمرانی کردنی و دامو دەزگاو چالاکی یە کۆمەلایەتی و ئاینی و رۆشنبیری یەکانی گەشەیان کرد .

ئەم باسە لەبارەی ئەرتەقی یەوە ، ئەو ماوەیە دەگرێتەوە کە لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەلجوقی دا دەستی پێ کردووەو بە لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی تەیموری لەنگو دەرکەوتنی هەردوو میرنشینی بەرخی سپی و بەرخی رەش لەناوچووە . لە سەردەمی خیلافەتی عەباسی و فاتمی و سەلجوقی و ئەیوبی و خاچپەرستانو مەمالیك و تەتەرو جەلایری و میرنشینە بچوکەکان دا حوکمرانی کردووە .ئەم باسە بە دوورو درێژی باسی زروفی دروستبوونی میرنشینە ئەرتەقی یەکان دەکات لەگەڵ کارکردەکانی روخانیانو سروشتی پەیوەندی یە دەرەکی یەکانیان بە ولاتو میرنشینەکانی هاوچەرخیان دەستنیشان دەکاتو سیستەمو دەزگاو چالاکی یە جۆربەجۆرە شارستانی یەکانیان شیدەکاتەوە .

دەرکەوتنی ئەرتەقی یەکان لەسەر شانۆی سیاسی و

عەسکەریدا بە سایەی باپیرە گەورەمانەوە (ئەرتەق کوری ئەکسکەوە) بوو کە لە دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقیدا دەورێکی ئەوەندە گرنگی گێڕابوو مایەی ئەوەی کە پلەو پایەی سەرکردایێتی دەستبکەوێو بەردی بناخەی قەوارەی سیاسی ئەرتەقی یەکان دابنێ . نەوەکانی دوای مردنی باپیرەیان لەو پەری ژووروی جزیرەی فورات لە ناوچەی دیاربەکر یەکەم میرنشینیان دامەزراند ، بەلاّم دوای مردنی (سقمان بن أرتق)ی دامەزرێنەری ، یەکسەر دووچاری پچڕپچڕیو پارچە پارچە بوون بوو . ئنجا قەوارەی سیاسی ئەرتەقی یەکان لە سێ میرنشیندا چوزەری کرد یەکێکیان لە ماردینو ئەوی تریان لە قەلاّی کیڤاو سێیەمیان لە خرتبرت لەسەر سنووری ژووروی دیاربەکر بەرەو ئەنادۆل .

کاتێك عمادالدین زنكی ساڵی ٥٢١ ی کۆچی لە موسڵ میرنشینەکەی دامەزراندو هەوڵی دا کە بۆ بەرەنگار بوونی خاچپەرستان میرنشینە ئیسلامی یەکان یەك بخات بەلاّم ئەرتەقی یەکان لە ترسی ماڵو موڵکی خۆیان دەستیان کرد بە دوژمنایەتی کردنیو ئەم ناکۆکی یەش کە سەردەمی حوکرانی نورالدین محمودی کوری (٥٤١-٥٦٩ی کۆچی) کزبوو . کاتێك صلاح‌الدین ساڵی ٥٦٩ ی کۆچی دەوڵەتی ئەیوبی یەی دامەزراند ئەرتەقی یەکان لە دژی خاچپەرستان یارمەتی عەسکەری ئەیوبی یەکانیان دا ؛ بەلاّم دوای مردنی ، پەیوەندی نێوان هەردوو لا تێكچوو ،ئەمانیش ئەمەیان بە هەل زانیو پەیوەندی نێوان ئەرتەقی یەکانیان تێكداو ناکۆکی یان خستنە مابەینەوە و بەمە توانیان دوو میرنشینی ئەرتەقی برِوخێنن کە میرنشینی قەلاّی کیڤاو میرنشینی خرتبرت بوو .

کاتێك تەتەرەکان دەرکەوتن ، ئەرتەقی یەکان دوای شەرێکی دوورودرێژو بەربەرەکانی یەکی سەخت سەریان بۆ شۆرکردن . بەلاّم کە دەوڵەتی تەتەر (ئەیلخانی) لاوازبوو ئەرتەقی یەکان پەیوەندی یان لەگەڵدا برینو روویان کردە مەمالیکەکان بەلاّم دەرکەوتنی تەیموری لەنگو لایەنگیرەکانی لە سەرکردەکانی هەردوو میرنشینی بەرخی سپیو رەش زەبرێکی گورچك بری لە ئەرتەقی یەکان داو میرنشینی لە ماردین روخاند .

پەیوەندی ئەرتەقی یەکان بە خاچپەرستانەوە گرنگترین ئاڵقەی زنجیرەی مێژووی سیاسیو عەسکەری یانە ئەویش بەهۆی کاریگەریو بەپێزی لە قۆناخە جۆربەجۆرەکاندا . . . دوای ورِدبوونەوەو لێکۆڵینەوەی سەرچاوە جۆربەجۆرەکان بە عەرەبیو رۆژئاوایی و کۆنو نوێوە بۆمان دەرکەوت کە ئەم پەیوەندی یە پێنج قۆناخی بریوە : قۆناخی یەکەم (قۆناخی هاوپەیمانێتی بەستن لەگەڵ هێزە ئیسلامی یەکاندا)ی پێ دەوترێو لەم قۆناخەدا سەرکردەکانی ئەرتەقی یەکان هەوڵیاندەدا بچنە نێو ئەو کۆمەڵەو پەیمانە ئیسلامی یانەوە کە سەلجوقەکان بۆ بەگژداچوونی خاچپەرستان رێکیان دەخستنو سەرپەرشتی یان دەکرن . قۆناخی دووەم (قۆناخی هاوپەیمانێتی کردن لەگەڵ خاچپەرستانە) هەندێ سەرکردەی ئەرتەقی یەکان وایان لێك دەدایەوە کە بەهۆی زۆرەملێی سەلجوقی یەکانو جەوری میرە ناوخۆییەکانەوە ناچاربوون پەنابەرنە بەر داگیرکەران . قۆناخی سێیەم (سەرکردایەتی کردنە)و لەم قۆناخەدا ئەرتەقی یەکان دژی خاچپەرستان راپەرین بزوتنەوەی تێکۆشانو جیهادیان کردو لە زنجیرە شەرێكدا ئاکامی بە لایەكدا خەرانەیان وەدەست هێنا کە ئەوپەری کاریان کردە سەر رەوتی شەرەکان . قۆناخی چوارەم «گۆشەگیر» بوونە ، لەم سەردەمەدا عمادالدین زنكی دەرکەوتو خۆی سەرپەرشتی بەگژداچوونی خاچپەرستانی گرتە ئەستۆ ، قۆناخی پێنجەم دەتوانرێ ناوی قۆناخی (یارمەتی یەکانی)لێ بنرێ . ئەرتەقی یەکان هەوڵیان دا کە یارمەتی نورالدین محمودو ئەیوبی یەکان بدەن دژی داگیرکەران ، چونکە ئەو کاتە میرنشینە ناوچەییەکان بۆ بەرەنگاری کردنی خاچپەرستەکان جۆرە یەکێتی یەکی فیدرالی یان لەنێو خۆیاندا دامەزراندبوو .

ئەم یەکێتی یەش بەسایەی نوالدین محمودو صلاح الدینەوە بوو کە ئەوپەری بەتواناو لێهاتوو بوونو لە پێناوی رووبە رووبوونەوەی دووژمنی هاوبەشدا زۆر بە ئاسانی داوای یارمەتی یان لە میرنشینە ئیسلامی یەکان دەکرد .

هەروەها ئەرتەقی یەکان لە لایەنی سیاسیو سوپاییەوە لە ناوەراستی سەدەی پێنجەم تاوەکو سەرەتای سەدەی نۆیەمی کۆچی دەورێکی گرنگیان گێرا . . . . شارستانێتی ئەرتەق ، ئەوی راست بێ ، یەکەیەکی بچوکی پێکەوەگونجاوە لە چوارچێوەی یەکەیەکی شارستانی گەورەتردا کە رەگ‌وریشەی بۆ سەردەمی سەلجوقی یەکان دەگەرێتەوەو لە سەرنەمی مەمالیكدا نەمامەکەی هاتە بەر .

---

١ - ناونیشانی باسێکە لە مێژووی ئیسلامی عمادالدین خلیل پلەی دکتۆرای پێ وەرگرتووەو د.حسین حبشی مامۆستا لە کۆلیجی ئادابی عین شمس سەرپەرشتی کردووە . ئەم پوختەیەش لە گۆڤاری (تأريخ العرب والعالم)ژمارەی -٢٣- ی (ئەیلولی ١٩٨٠)وەرگیراوە .



# تەقینی بورکانی ئەمریکی

## بیست کیلۆمەتر دووکەڵی بۆ ئاسمان بەرزبووەوە!

وەرگێڕانی

ڕۆشنبیری نوێ



لە مانگی کانوونی دووەم . ینایری ساڵی (١٩٨٠) دا . کۆمەڵێ لە زاناکانی «چینی زەوی» ی ئەمریکی توێژینەوەیەکیان دەربارەی بورکانی «ماونت سانت ئلینز» بڵاوکردەوە کە دەکەوێتە هەرێمی واشنتن . سووربوون لەسەر سامناکیی و ناهەمواری باری بورکانەکەو تەقینەوەیو کارکردنی‌یە سەر ژیانی کەسانی ئەو هەرێمە کە لە نزیکی بورکانەکە دان . . . ڕۆژنامەی «لۆمۆند» ی فەرەنسی لە بیست و چواری کانوونی دووەمدا کورتەی ئەو توێژینەوەی بڵاوکردەوەو دەڵێ : « تەقینەوەی ماونت سانت ئلینز زۆر دوا ناکەوێ لە ماوەی سەدەییکدا دەبێ بتەقێتەوە . .

دوور نیە کە لە کۆتایی ئەم سەدەیەی ئێستاماندا بتەقێتەوە» . دووربینی زانایانی ئەمەریکی بەشێکی ئەم ڕاستی‌یەیان سەلماند چونکە تەقینەوە گەورەکە پێش بڵاوکردنەوەی توێژینەوەکە دەستی پێ‌کرد . بە کەمتر لە چوار مانگێ . . زانایان تووشی

سەرسورمان هاتن ، کە لە نزیکەوە زیاتر لە هەژدە مانگ سەرنجیان دەدا ، کە چۆن بەم پەلەیەو بەم مەزنییە تەقییەوە ، ئەوان وایان دەزانی‌و وایان دانابوو کە هەندێ لاوازە گەر بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو بورکانانەی کە هەرەشەی تەقینەوە دەکەن‌و دابەش بوونەتە سەر چەن هەرێمێك لە جیهاندا . . ئەو تەقینەوەی کە رووی دا زیاتر بوو لە هەموو ئەو پێش‌بینی‌یانە ، وزەی تەقینەوەی گەیشتە زیاتر لە دە میناتەن ، واتە زیاتر لە پێنج سەد جار لەو بۆمبا زەری‌یەی کە خرایە سەر هیرۆشیما لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم‌دا کە وزەی نەگەیشتبووە بیست کیلۆتەن . . گەر بهاتبا ئەو هەرێمەی نزیك «ماونت سانت ئیلینز» بە چڕی کەسانی تیادا بوایە ئەوا ژمارەی لەناوچوونی دەگەیشتە سەدان هەزار کەس ، وەك رووداوی ئەو بوومە لەرزەیەی کە هەرێمێکی لە ولاتی چینی راماڵی‌و ژیانی نزیکەی ملیۆن کەسێکی سەرنگوم کرد کە لە ساڵی ١٩٧٥ رووی دا . . .

هەڵسوکەوتی چیای سانت ئیلینز لەگەڵ تەقینەوەی گەورەی بورکانیا کارێکی نوێ نیە . . تەمەنی چیاکە زیاترە لە سیو حەوت هەزار ساڵ ، وەك گۆڤاری «سیانس» «زانست» ی ئەمەریکی لە ژمارەیێکدا لە بەرواری حەوتی مانگی ١٩٧٥ دا سەلماندی . . کە چەند تەقینەوەیێکی گەورەی بینیوە لە سەدەی سیانزەهەمی پێش زاینەوە تا ئەمرۆ . . هەروەها بە توورەیی‌و زەبرەوە خۆی نواند چونکە خامۆش‌بوونی درێژخایەنی بە خۆوە نەبینیوە وەك بورکانە ئاساییەکان نەبووە . . بورکانی «ماونت سانت ئیلینز» لە تەمەنیا لە دوو سەدە زیاتر خامۆش نەبووە ، دیسان گوڕی پەیداکردووەو سەرلەنوێ تەقیوەتەوە .

وا دەکەوێتە بەرچاو کە ماوەی دوو سەدە ماوەیێکی زۆر دوورو درێژە بەڵام راستی‌ی پێچەوانەی ئەمەیە . . ماوەی دوو سەدەیێك ئەوەندەی چەند دەقیقەیەکی تێژڕەوە گەر بپێورێ لەگەڵ تەمەنی زەمانەدا .

لەم توورە سوێنەرەی ئەم بورکانە زانایانی ئەمەریکایی ترساندووەو هانیانی داوە جۆرەها توێژینەوە ئامادە بکەن بۆ دۆزینەوەی کاتی تەقینی پێش ئەوەی بتەقێتەوە ئەویش بۆ وریاکردنەوەی خەڵکی‌و گواستنەوەیان لە جێ‌ی ئەو خاپوورکاری‌یەوە بۆ جێ‌یەکی دی‌و کەم‌کردنەوەی زیان‌و ترسی ئەم سامناکە . . کەچی هەموو هەوڵدانێ بۆ دوورکەوتنەوە لەم مەینەتی‌یە سەرکەوتنی وەدەست نەهێنا ، ئەوەی حیسابی بۆ نەکرابوو لە هەژدەی ئایاری رابوردوودا رووی دا ، مەینەتییەکە ماوەیێکی زۆری کێشا بە جۆرێ نەتوانرا تا هەفتەی یەکەمی مانگی حوزەیران رادەی زیان بە شێوەیێکی روون دەسنیشان بکەن ، گەر خەمڵی سەرەتایی گەیشتبێتە نزیکەی هەزارو پێنج‌سەد ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی ، ئەوا زیانی گیانی کەسان دوا ژمارەی تیپی هێزی فریاهاتن هەشت تەرمی دۆزیوەتەوە لە کاتێکدا کە پۆلیسی تایبەت هەواڵی پێ‌گەیوە کە نزیکەی هەفتا کەسێ سەرنگون‌بوون .

## چیاکان دەناڵێنن

دەربارەی سەرەتای تەقینەوەکە کە لە بیست‌و حەوتی مانگی ئازاردا دەستی پی‌کرد گۆڤارو رۆژنامە ئەمەریکی‌یەکان لەم بارەیەوە زۆریان نووسی ، بۆ نموونە «تایم» وتارێکی پەیامنێری خۆی لە شوێنی رووداوەکەوە بلاوکردەوە کە باسی ئەو هەرێمە دەکات پاش تەقینەوەکە چی بەسەر هاتووە . . هەروەها وێنەگری رۆژنامە دایفد کرۆکت بە رێکەوت لە نزیکی «ماونت سانت ئیلینزدا بوو ئەو هەورە رەش‌و بەردە ئاگرینانەی بینی ئەو شوێنە رادەماڵی‌ کە لێیدا بوو ، شەپۆلێکی رەش قومی گەرمی لێ دەباری : «تەسجیلەکەی دەکاتەوە لە سەرنەوارێ ئەم چەن ووشەیە بە پەلە تۆماردەکات کە رەنگی هەستی دەداتەوەو نزیکی مردن بووەو ئەم دیمەنە سامناکە دەبینێ ، دەڵێ :

«خواوەند بەزەییت . . مەرگ نزیکە . . گوێم لێ‌یە لە پشتمەوە چیاکان دەناڵێنن‌و دەلەرزنەوە . . قومی گەرم داچۆراوەتە نێوچاوەمەوە . . خواوەند ئەمە دۆزەخە . . .

دۆزەخی رەش . . دەمەوێ بژیم . . یارمەتیم بدە تا هەناسە هەڵکێشم . . من هیچ شتێ بەدی ناکەم . .

کە لە وەخۆچوونەکەی وەئاگا بووەوە بینی‌ی شەپۆلە رەشەکە بووەتە دوو بەشەوە بەهۆی تەپۆلکەیەکەوە کە لە ناوەندی رێگاکەدا بوو رێرەوی گەرماوەکەی گۆڕیوەو ئەم وێنەگرەی رۆژنامە کە لە تەلەفزیۆنیشدا ئیش‌دەکات لە مردنێکی سەخت رزگاری کردووە .

## رووباری بێ دەر

گۆڤاری «نیوزویك» باسی رووباری کۆلۆمبیا دەکات — کە دەکەوێتە بەر بەردە ئاگرنییەکانی بزرکانەکە دەڵێ : ئەم رووبارە کە قولایی چل پێ بوو بەرینیشی شەش سەد پێ ، ئێستا بەهۆی تەپ‌وتۆزو قوڕو بەردە ئاگرییەکانی بورکانەکە قوولایی بووەتە چواردە پێ‌و بەرینیشی هەند گرژ بووەتەوە گەیوەتە دووسەد

پیێ ، ئەمەیش بووەتە هۆی ئەوەی سیوو یەك گەمی دواخات لە کار کە لە کاتی کارەساتەکە لەوێدا بوون ، بەری رووبارەکە گیراوە لەنێوان ئەم دوو هەرێمەدا «لۆنفیتیۆ» لە ویلایەتی واشنتۆنو «ستۆریا» لە ولایەتی ئوراغۆن ، ئەمەیش کەشتیەوانی دوا دەخاتو زیانێکی رۆژانە دەگەیێنێ کە نزیکەی پێنج ملیۆن دولارە ، سەرباری ئەمانەش ، خەزێنە بە خەملێ گۆڤاری « تایم» ناچاردەبێ دوو سەد ملیۆن دۆلاری خەرجکات بۆ خاوێنکردنەوەی ئەو رێگاوبانانەی کە بەردو خۆڵو قوم –ی بەسەردا کەوتووە ، و درێژایی ئەم رێیە لەکار کەوتووانە پێنج هەزارو نۆ سەد میل زیاتر نیە!!

زانایانی چینەکانی زەمین لە ئەمریکا دەڵێن ئەم هەژنە پلەی لە یەك تا چوار زیاتر نەبووە بەپێی پێوەری ریشتەر ، زیان زیاتر دەبوو گەر لەو کاتەدا بتەقایە کە کرێکاران بۆ دار برین دەچوونە بنار «ماونت سانت ئیلنز» ەوە کە ژمارەیان دوو سەد کەسە ، هەروەها رێکەوتوابوو کە تەقینەوەکە لە رۆژی یەكشەممەدا بێ ، نە قوتابی لە قوتابخانەدا بووو نە کرێکار لە کارگەو کێڵگەدا بوو چونکە رۆژی پشووی هەفتانەیە ، تا ئەو سێلاوە گەرمانەی لە بەرینی بیست کیلۆمەتر بە دەوری ترۆپکدا بڵاوبووەوە ، ئازاری بە زۆر کەس نەگەیاند ، چونکە هەرێمەکە لە بەیانی رۆژی یەکشەمەدا هەندێ چۆڵ بووو کەمتر رێبوارانی لێبوو ، ئەو خەڵکە کەمەی کە قومو هەورە دەرپەڕیوەکانی بورکانەکەیان بینی کە شەستو سێ هەزار پێ ، نزیکەی بیست کیلۆمەتر بەرەو ئاسمان چووە ترسو لەرزیان لێ نیشتو خۆیان دوور گرتو لە شوێنی هەندێ قایمدا خۆیان حەشار دا ، هەموو ئەم وورباییە بووە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی سەرنگونبووان .

## رووداوەکان لە مێژوودا

رووداوەکانی بورکان لە مێژووی ئینساندا هەند زۆرە لە ژمار نایێت ، بەڵام گرنگترینی هەموویان ئەوەبوو کە سەدانی سەرنگون کرد ، رووداوە بەناوبانگەکە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٧٩ کە بورکانی فیزۆف لە ئیتالیا تەقییەوە کە لە دووری هەشت کیلۆمەترە لە خوارووی رۆژهەڵاتی شاری ناپوڵی . . . لەو رۆژەیدا ، فیزۆفی توورە هەردوو شاری هرکولانومو بومبایی لەسەر رووی زەمین سڕییەوەو هەزارانی سەرنگونکرد ، لە ساڵی ١٦٣١ دا جارێکی تر فیزۆف تەقییەوە ئەم جارەشیان سێ هەزارێکی سەرنگونکرد .

ژمارەی سەرنگونبووان چەندین کەرەتێ لەمە زیاتر بوو کەچیابی تەنیا لە دورگەی (صقلیە)دا تەقییەوەو بیست هەزار کەسی کوشت ، ئەویش لە سالی ١٦٦٩ دابووو لە ساڵی ١٨٨٣ دا ژمارەی کوژراوان گەیشتە سیو شەش هەزار کەس کاتێ کە بورکانی کراکاتووا لە وڵاتی ئەندەنوسیا تەقییەوەو لە سەدەی ئێستاشماندا کارەساتی یەك لەدوای یەکی بورکانی لە ساڵی ١٩٠٢ دا لە ئەنجامی تەقینەوەی بورکانی چیای «بیلیە» لە دورگەی (مارتینیك) ٢٩٩٣٣ بیستو نۆ هەزارو نۆسەد و سیو سێ کەسی کوشتو پلەی گەرما لە شاری (اسنت بیاردا) گەیشتە ١٨٠٠ هەزارو هەشت سەدی فەهرەنهایت ، کە بووە هۆی رواندنەوەو خاپوورکردنی شارەکە لە چەند ساتێکی کەمدا ، و لە ساڵی ١٩٦٣ دا لە ئەندەنوسیا بورکانی نوێ تەقی کە ناوی «ئاغوخ»و لە دورگەی (بالی)دا بووە هۆی کوشتنی هەزارو پێنج سەدو هەشتاو چوار کەس!

## هۆی تەقینەوە

«ماونت سانت ئیلینز» کە بە توورەو زەبردار ناسرابوو . لە مێژەوە چووبووە دۆخی بێ جوولەییەوەو لە ساڵی ١٨٥٧ ەوە هیچ هەرەشەی تەقینەوەی نەکردووە ، وادیارە کارەکان لەنێو چیاکەدا بە جۆرێکی دی گەورە بووە تا گەیاندییە رادەی تەقینەوە . . زانا ئەمریکییەکان دەڵێن : هۆی تەقینەوەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاوەی داچۆڕاوەتەوە نێو بورکانەکەوە . لە ئاوەوە بووەتە گاز . . وادیارە وەك بۆچوونی زانا فەرەنسیەکان ، ئەو سەنگانەی لە رۆژی هەژدەی مانگی ئایاردا بەسەر ترۆپکی چیاکەوە بووە هەند رەق بووە بەجۆرێ نەیهێشتووە بە ماوەی ئاسایی بورکاندا تێپەرێ ، بەم جۆرە کەڵێنەکانی بورکانەکەی گرتووەو بەردە ئاگرینەکانکۆوەبوون تەوژمێکی بەهێزیان دروستکردووەو ئارەزووی دەرپەڕینیان پەیداکردووە . . ئەم تێکچرانە بووە هۆی تەقاندنی ٤٢٥ مەتر لە ترۆپكو کردنی بە قومو ئەو کونەی کردوە کە ناوی دەمی بورکانی پێ دەوترێ بەرینی (٣) کیلۆمەتر درێژاییو (١ر٥) کیلۆمەترو نیوێك پانایی . .

هەتا ئەم کارەساتەیش مرۆڤی ئەمریکی خستیە باری گێژداوی ژیانی تەکنەلۆژیایو شکەوە . . ترسناکی ئەم مەینەتییەو ژمارەی کوژراوانو زیانی سەدان ملیۆن دۆلار ئەمە گشتی بای ئەوە نیە مرۆڤی نوێ بگەڕێتەوە بۆ خودی خۆو مرۆڤایەتیی تا لە سیاترین باردا چۆن دراو پەرستیی دەستی بەسەر هەموو شتێکدا گرتووە .

بەشی یەکەم

# وەفایی و گۆرانی موسیقای کوردی

عثمان شارباژێڕی

– بەر لەوەی لە هەستیارێک ( وەفایی) و هۆنراوە داناتی و هونەرمەندی و هەوا داهێنانی بدوێین لێرەدا جێی خۆیەتی چەند وورده باسێک سەبارەت بە لە دایکبوون و مردن و جێگای کۆچی دوایی ( وەفایی) بخەینە روو .

● مامۆستا گیو موکریانی دەڵێت .
( وەفایی ) نێوی حاجی میرزا عبد الرحیم

کوری مەلا غەفووری کوری مەلا نصر الله رەحمانی‌یە لەبەرەی مەلاجامی‌یە ، . . . .

– لە ساڵی ١٨٤٤ لە سابلاغ پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە –

– **لە ساڵی(١٩١٤)م :دا لە چۆڵی شام چەنگاڵی مەرگ بەنەخۆشی ( زەحیری) یەوە ریشەی گیانی کیشا)**[1]

– مامۆستا علاء الدین سجادی لە مێژووی ئەدەبی کوردیی‌دا لەژێر ناوو نیشانی ( باخی شاعران) نوسیویێتی .

( میرزا رەحیمی وەفایی ١٨٣٨ – ١٨٩٩)[2]

– مامۆستا نجم‌الدین مەلا لە رۆژنامەی ( ژین)دا لە گۆشەی ( شیعرو شاعیرەکانمان)دا ،

دەربارەی بوون‌و مردنی ( وەفایی) نوسیویێتی

– ١٨٤٤ م لە شاری سابلاّخ – هاتووەتە دنیاوە .

– ساڵی ١٩٠٢ لە چۆڵی شام‌دا کۆچی دوایی کردووە .[3]

– بەپێی نوسینەکەی مامۆستا گیو :

● وەفایی ( ١٨٤٤ بووە) ( ١٩١٤) مردوە

– بەپێی نوسینەکەی مامۆستا سجادی .

● وەفایی ( ١٨٣٨ بووە ) ١٨٩٩) مردووە .

– بەپێی نوسینەکەی مامۆستا نجم الدین مەلا :

وەفایی (١٨٤٤ بووە ) ( ١٩٠٢) مردووە .

● مامۆستا محمد علی قەرەداغی ، ساڵی ١٩٧٨

هۆنراوەکانی وەفایی لە دیوانێکی نوێو نایاب‌و جوّی لەچاپەکانی پێشووو لە شێوەیەکی جوان بەپێشەکیەکی پرو پاراوو لێکۆڵینەوەیەکی تازەو تەواو ، ا

چاپ‌داوەو بڵاوی کردووەتەوە .

سەبارەت بە ساڵی لەدایك‌بوون‌و مردن‌و جێگەی مردنی وەفایی ، لە زۆری پرسیوە زۆر سەرچاوەی پشکنیوە ، بڕێ زانیاری باشی دەربارەی ئەو هەستیارە مەزن‌و ئەو هونەرمەندە بلیمەتە ، بە دەست هێناوەو بە ئەنجامی گەیاندووە .

– مامۆستا محمد عەلی قەرەداغی ئەڵێت :–

– (مەبەستمان ساڵی لەدایك‌بوونی (وەفایی) بە ئەو سەرچاوانەی من خوێندوومنەتەوەو کەڵکم لێ وەرگرتوون ساڵی ١٨٤٤ ز بۆ ساڵی لەدایك‌بوونی وەفایی دائەنێن)[٤]

– مامۆستا محمد علی قەرەداغی نوسیویتی :–

( مامۆستا سنجەری(مەلاعەلی)بۆی گێرامەوە کە لە خوالێخۆش‌بوو پیرە مێردی بیستووە) پیرە مێرد ووتی :–( دوای زیارەتی مەدینە چووین بۆ زیارەتی(ئوحد) !

وەفایی لەوی تووشی نەخۆشی سکك چوون بوو ، لەوێ کۆچی دوایی‌کردو بەخاك سپێرا)[٥]

– ● مامۆستا محمد عەلی قەرەداغی دەڵێت :

( هێشتا بەشێوەیەکی راست‌و بروا پێکراو ساڵی کۆچی دوایی دیاری نەکراوە)[٦]

● ( بەگوێرەی هەموو نووسراوەکان گومان لەوەدا نی‌یە کە وە فایی لە رێگەی حەج مردووە ، بەڵام لە چ جێگایەکی ئەو رێگە دوورو درێژەدا مردووە ، ئەمەیان جێگای باس‌و گومانە)[٧]

– هیوام هەیە ئەم باسەی لێرەدا ئەیخەینەروو ، ئەم چەند گرێ نووسینانەی خودی (پیرەمیرد) ئەوگرێ لۆیرەیە بکاتەوەو گومان نەهێڵێ .

● ( پیرە مێرد ئەڵێ :–

(١) (سەید ئەحمەدی خانەقا) کەرەمێکی باشی لەگەڵ غەزەتەکەمان کرد بەڵام ئێمە هیچ تەشەکوری ناکەین چونکە ئەو . . . . فرە ! !

ئەمە پیشەیەتی ، ئەوەندە هەیە ، لە خوا ئەپارێمەوە جارێ تا من ماوم ، ئەویش بمێنێ وەك لە (چۆڵی رێی حەج) (وەفایی) (نایە چاڵ ، منیش گۆڕ بەگۆڕ بکاو نەختێ بۆم بگری ئینجا کەیفی خۆیەتی[٨]

( ژین ) ژمارە ( ٨٥٠ ) کانونی یەکەم / ١٩٤٦

(٢) پیرە مێرد ئەڵێت :

(چل‌و پێنج ساڵ لەمەوبەر ، لە ئەستەمبوڵەوە ! چوو بوومە کەعبەی حیجاز لەوێ کەوتمە ناو (دەستە مێردێکی مەرد) سەرقافڵەچی‌یان ( سەید ئەحمەدی خانەقا) بوو ، نازانم تەئسیری هاونەفەسی ئەو خاکە بوو ؟ یا دووری وەتەن بوو ، ئەمەندەم پەسند کرد چل شەو لە بیابانی حیجازو شاما بە ، یەکەوە بووین)

ل ٢ (ژین) ژمارە (٨٩٢) ١٩٤٧

– بەپێی ئەم قسەیەی پیرە مێرد ئەم چوونە حەجەی ساڵی (١٩٠٢) ئەکات .

(٣) هەروەها پیرە مێرد ئەڵێت :–

(بەیادی زیارەتی ( سەید ئەحمەدی خانەقا) دا ، بیرم کەوتەوە ، ئەو ساڵەی کە چوو بووینە( حەج) ، (رشانەوەیەك بوو) نەوعی( قولێرا) ی ئەم ساڵی میسر ، تەنانەت ئێمە (کەڵە مێرد بکمان لە ( معلا) ناشت)

ل١ ( ژین) ژمارە ( ٨٩٢) ١٩٤٧

– بەو نوسینانەی ( پیرە مێرد ) دا ئەمانەمان بۆ ئاشکرا دەبێت .

(١) چل‌و پێنج ساڵ لەمەوبەر چووبوومە (کەعبە) ، ساڵی (١٩٤٧) ئەو قسەیەیکردووە واتە ساڵی ( ١٩٠٢) چووە بۆ حەج .

(٢) کەوتووەتە ناو دەستە کەڵەمێردێکی مەرد ، سەر قافڵەچی‌یان ( سەید ئەحمەد( بووە ،

(سەید ئەحمەد) و (وەفایی) پێکەوە بوون لەو حەج کردنەدا .

(٣) – (سەید ئەحمەد) لە چۆڵی رێی (حەج) (وەفایی) نایە چاڵ .

(٤) ئەو ساڵەی چووە بۆ حەج رشانەوە ( کۆلێرا هەبووە کە ڵەمێردەکەی بەرشانەوە مردووە (وەقایی) بووە .

(٥) لە (مەعلا) بەخاکیان سپاردووە .

(مەعلا = مەعلولا) دێیەکە کەوتۆتە سەرووی شاری (دیمەشق) لە سوریا .

(٦) پیرە مێرد ئەڵێ( بەدەستی خۆم لە لمی عەرەبستاندا وەفایم ناشتووە)[٩]

(٧) لە رێگای عەرەبستان (وەفایی) مەلا عەبدول رەحیم ، ئەمری خوای کردووە ، (حاجی تۆفیق بەگ)

ئەفەرموێ :( بەدەستی خۆم لە لمی چۆڵی عەرەبستاندا ناشتومە)[١٠]

(مامۆستا نجم الدین مەلا)

(٨) بەپێی ووتەکانی پیرە مێرد ساڵی حەج کردنیان ( ١٩٠٢ ) بووەو لەو سەفەرەدا ( وەفایی) مردوە کەواتە ساڵی کۆچی دوایی ( ١٩٠٢ ) بووەو بە رشانەوە ( کۆلێرا ) مردووە ١ گۆڕەکەی لە ( معلا) ی خاکی سورییەدایە .

### – وەفایی‌و هۆنراوە

– هۆنراوەکانی وەفایی ئەگەر چی تارایەکی تەنگ‌و ئاڵی دڵداری‌یان بە رووودا دراوە هەر دێرێك لە شیعرەکانی بووکێکن بۆ دڵداران .

– وا بەگەرمو گوری باسی ( عەشقو عەرەق) ئەکا ، لەوانەیە زۆر نا ئاشنا بە ( وەفایی) کە هۆنراوەکانی بخوێننەوە یا بکەوێتە بەر گوێیان خێرا بڵێن ئای لەم شاعیرە عەجەب ( عاشقێکو عەرەق خۆرێکی) بێ ئامان بووە .

– ئەی ئەوە نی یە ووتوویەتی :

(دەمێك ساقی ، دەمت بێنە ، دەخیلی چاوەکانت بم)

(بەجامێك دەستی من بگرە ، فیدای پیری موغانت بم )

ل ٥٢ دیوانی وەفایی – ١٩٧٨

– نەك تەنیا (وەفایی) بەڵکو زۆربەی شاعیرەکانی کۆنی کوردەواری‌مانو تا ئەم دەمانو زەمانەش وەکو شێوەی شیعرووتنی ، شاعیرانی (عەرەب)و (فارس) و (تورك) شیعریان‌داناوە لە باسو بابەتی ( عەشقو عەرەقو پیاهەڵدانو بریێ شتی تردا ! هۆنراوەکانیان ، خۆخڵەتاندنو دووفاقی تێدایە ، ئەگینا (مەولەوی) خەیاڵ تیژو خوا پەرستو فەیلەسوفی وەسف)

ئەگەر لاسایی (خەمریات) ی ( خەیام) و (قاانی) و (عومەری کوری رەبیعە) نەبێ ، توخوا کامە (هەمیشە مەست) و (مەیخۆر) و چاکترین شەیدای (شەرابو شەمپێن ) ، ئەتوانیو ئەزانێ ئاوا وەسفی مەی بکا ، ؟

**(هەر عەمارەتێك ، حەزکەی باقی بێ)**

**( ئاو – مەی ) ( خاك – خڵتەی ) ( بەنای – ساقی) بێ)**

ئەگەر کەسێك لە سروشتو رەوشتو ئاینداری (مەولەوی) ئاگادار نەبێ ، بەم دێرِ هۆنراوەیەدا یەکەم دەردوك ، وا تێئەگا لەناو سەبۆی شەراب‌دا چاوی هەڵ هێناوەو پێگەیشتووە ، لە کاتێکدا مەگەر (مەی) و ( خەمر) و (عەرەق) ی تەنیا بەناو ، لەناو کتیب‌دا ، دی‌بێ ، باوەر ناکەم بۆنی (عەرەق) ی بە (لووت) یشدا چووبێ ، مامۆستا زیوەر بە هۆنراوە بەگژ (پێکەس) ی نەمردا چووەو دژی (عەرەق) ئەڵێ :–

**« عەرەق ناخۆم کەتووشی دەردی سەر بم**

**« گرفتاری هەزار دەردو خەتەر بم»**[١٢]

لە هۆنراوەیەکی تردا مامۆستا زیوەر دەڵێت .

**« ساقی بەجلوە هەستە بوم تێکە یەك قەرابە**

**« ئەمشەو بەیادی چاوت مەیلم لەسەر شەرابە »**[١٣]

– لێرەدا بە ئاشکرا دیارە کە ئەم شاعیرە نەمرە بە (پێك) و (قاپ) رازی نابێو داناکەوێ ، داوای یەك ( قەرابە) ئەکا ، لەکاتێکدا هەر ئەم شاعیرە زۆر رِقی لە عەرەق بووەو ئەڵێت .

**« لەبۆنو بۆگەنی بێزارە تەبعم»**

**« فیدای ئەمری خواو پێغەمبەر بم »**[١٤]

کەواتە زووربەی شیعرو شیعردانانی هەستیارەکانی پێشینیان هەر بۆ دەرخستنی تواناو

سەلیقەداریان لە بابەتەکانی هۆنراوەدا بووە ، و بەس ، (ووشەو دڵ) یان یەك نەبووە لە بارەی (مەی) و مەینۆشی) یەوە .

وەهەر لە هەمان هۆنراوەدا ( وەفایی) دەڵێت :–

**(موقیمی خاکی دەرگای تۆ ، حەریمی جەننەتە جێگای)**

**( لە لوطفی تۆ چ کەم نابێ ، منیش ریزەی سەگانت بم)**

ل ٥٣ ديوانی وەفايی / ١٩٧٨

– ئەگەر کەسێك بەسادەیی‌و سەر پێی سەیری ئەم دێڕ هۆنراوەیە بکا ، وا ئەزانێ شاعیرەکە یەکجار ( سێکسی‌و سادی بە ، حەز ئەکا خۆشەویستەکەی لوتێ لەگەڵدا بکاو بەسەگێکی بەر دەرگاکەی ڕای بگرێ ، بەلام ، خۆشەویستی ( وەفايی) لێرەدا بۆ ( پێغەمبەر – محمد) ە (د – خ) ، لەم دێڕە هۆنراوەی تردا بە ئاشکرا مەبەستەکەی (وەفايی) دەر ئەکەوێ .

« ئەمن کوردو دڵ ئیفتادە ، ئەتۆ شۆخ‌و عەرەب زادە »

« مەگەر بمرم ، بە بەختی خۆم دەمێکی هەمزو بانت بم »

ل ٥٣ ديوانی وە فايی / ١٩٧٨

– بەڵێ (وەفايی) کوردو دڵ کەنفت دڵبەندو

پابەندی شۆخێکی عەرەب زادەیە . .

ئەو لە سابلاخ ، و ئەبێ ئەو خۆشەویستەی لە کوێ بێ ، بێگومانم لە (مەدینە) یەو لە هۆزی (قورەیش) ە ! .

لە جیهان‌و ژیانی‌دا پێی ناگاو زمانی نایگاتێ ، تەنیا لەمردن‌و لەقیامەت‌دا ، ئەگەر (موسوڵمان) بێو بەختی یار بێ ، دەمێکی ببێتە هاورازو هاوزمانی . ! .

– هۆنراوەکانی (وەفايی) ماناو مەبەستیان قوڵ ڕەگی‌دا کوتاوە ، پێویستی بە پسپۆڕو پێزانە ، لە هەڵهێنانی هونەری شاراوی ڕازونیازی دڵو دەروونی ئەو شاعیرە مەزنە ،

« کەس نی‌یە ، لەو نیکتە حاڵیم کا ( وەفايی ) دولبەرم »

« خۆی دەمی هێنا ، ئەمن گەستم ، دڵی بابی شکا»

ل ١٥ ديوانی وەفايی – ١٩٧٨ .

– (وەفايی) ، شاعیرێکی تەڕ دەست بووە ، لە ووشەبازی‌و ڕستە سازی‌دا سەرو ساختێکی چاکی بووە ،

لە دانانی (ئاوازو هەوا) دا شارەزا بووە ، لە (تاکت‌و تیمپۆی) ی هۆنراوەش‌دا وەستابووەو مامۆستابووە ، وا دوو دێڕ هۆنراوەی لەم شێوازەدا ئەنووسینەوە ، هەست بەسۆزو ساوایی‌و ناسکی هۆنراوەکانی ئەکەین .

پەرێشانم
بلاوم
تێك شکاوم ،
خاوو شێواوم ،
دەڵێی شاماری زوڵفی تۆم
لە دووی تۆ ، شێت‌و عەبداڵم – .
بەنازی
چاوەکەی بازی
وەك بازی
بازی دام ،
هەتا پیربووم ،
دەستم ، هەر
بەنازی بمکوژێ
ئەو یاری منداڵم – .

ل ٦١ ديوانی وەفايی ١٩٧٨

(وەفايی) وەکوو هەموو پیاوێکی ئەم جیهانە حەزی لە جوانیی ئافرەت کردووە ، بەلام ئەو چاوەی ئەو کە جوانی ئافرەتی پێ دیوە کەم چاو مەگەر چاوی شاعیرە مەزنەکانی جیهان یا چاوی (مەولەوی) و (گۆران) واتیژو وورد بین بوو بن لە وێنە گرتنی جوانیی ئافرەت‌دا .

(بەخەی کراس لاچوو ، پشکووت بە هەردوو لێوان)

(گوڵو شەکەر دەباری ، لە کووچەی باغی سێوان)

(زوڵفی پرژاندو کوڵمی وەدەر ئەکەوت لە نێوان)

شەمس و قەمەر هەڵاتن ! دوێنێ بە نوێژی شێوان)

(وەفایی کەوتە کێوان
– شیرین ئەش دەرێسێ –

ل ١٩٤ دیوانی وەفایی – ١٩٧٨

– وەفایی – وەك ووتمان کرۆکی زۆر لە هۆنراوەکانی رازو نیازێکی ئایینی تێدایە ، بەڵام لە پیاهەڵدان بە ئافرەت و (جوانی ئافرەت) یشدا درێغی نەکردووە ، بۆیە تا ئەمرۆش زوربەی زۆری گوێندەو گۆرانیی بێژەکانی کورد تامەزرۆی هۆنراوەکانی (وەفایی) نو کردوویانن بە (ئاواز) و بە (بەستە) و (مەقام) ەوە ئەیانڵێن ،

بەڵام (وەفایی) لە ئافرەت و جوانی ئافرەت دا ، دڵبەندو پابەندی (گوڵ ئەندام) بووە ، (گوڵ ئەندام) دڵخوازی بووە ، شێوەی هەموو ئافرەتێکی شۆخی لە (گوڵ ئەندام) و (گوڵ ئەندام) ی لە هەموو ئافرەتێکی جوان دا ، دیوە » .

**(هەر لە حزمیە (وەفایی) وەکوو بولبول کە دەناڵێ**

**(کەس مەنعی نەکا عەشقی (گوڵ ئەندام) ی لەسەردا)**

ل ٩ دیوانی وەفایی / قەرەداغی ١٩٧٨

**( من وەها مەستی (گوڵ ئەندام کە نازانم**

**(هۆشی من دوگمەی ئەلا ، یا ساعیدی سیمین دەبا)**

ل ٣ دیوانی وەفایی قەرەداغی ١٩٧٨

**« گوڵ ئەندام ) – لەی ئەتاف گەردنم زوڵفی پەرێشانت»**

**(عیلاجێ ، چارەیە ، رەحمێ ، ئەمان دەستم بەدامانت)**

ل ٢٧ دیوانی وەفایی قەرەداغی ١٩٧٨

**(پەرچەم حەبەشی زادە ، فەرەنگی بوتی زیبام)**

**(سەرحەلقەیی شۆخانی ، پەری چیهرە (گوڵ ئەندام)**

ل ١٨٥ دیوانی وەفایی / م – ع –
قەرەداغی

**(بەو عاریضە ، بەو پەرچەمە ، بەو چاوە خومارە)**

**(گوڵ دەستە ، نیگا مەستە ، دەهەن پوستە ، (گوڵ ئەندام)**

ل ١٢٥ – دیوانی وەفایی / قەرەداغی

**(یاشەمس و قەمەر ، قەوس و قەزەح ، بەدرو هیلالسن)**

**(وا جوملە هەڵاتوون ، لە گریبانی (گوڵ ئەندام) .**

ل ٤٧ – دیوانی وەفایی – م . ع .
قەرەداغی

● – (وەفایی) و (مۆسیقاو گۆرانیی) .

– مامۆستا گیوی موکریانی دەڵێت :–
(وەفایی) دەنگیکی ئێجگار خۆش و پڕ سۆزو بێ وێنەی بووە) .(١٥)

وا ئەزانم ئەم دێرە هۆنراوەیەی ( وەفایی ) ڕاستی قسەی مامۆستا گیو ئاشکرا دەکات .

(دەنگی من و سەوتی تۆ ، بۆ بەزمی خوسرەوی)

چەنگ) و (نەی) و عوود) و (دەف) و (تار) و (شاناز) ن)

ل ٨٩ دیوانی وەفایی قەرەداغی

– هەروەها مامۆستا گیو دەڵێت .

(جار جارە وەفایی هەوای دا دەهێنا ئەو جار لەسەر ئەو ئەو بارەی هەڵبەستی دادەنا ، وفێری قوتابی بە دەنگخۆ – شەکانی خۆی دەکردو بەو جۆرە لەناو شارو هەندەراندا پەخش و بلاو دەبوونەوە)[١٦]

– سەبارەت بە هونەرمەندی وەفایی لە گۆرانیدا .

مامۆستا ( برهان قانع ) دەڵێت .

(مەلا عەبدول رەحیمی (وەفایی) گەلێك خزمەتی گۆرانی کوردی کردووە . ئاوازی بۆ شیعرەکانی خۆی دائەنا ، بە (فەقێ) کانی خۆی ، رەوان ئەکرد ، ئینجا گۆرانیەکە بە وولاتا بلاو ئەبووەوە ، وەکو ( خاڵەی رێبوار) کەچمکێکە لە بەرهەمی هونەری ئەو شاعیرە نەمرە)[١٧]

● – هەروەها مامۆستا گیو ئەڵێ :–

– (وەفایی) بوێژێکی زۆر دڵتەڕو دڵدارو سەودا سەرو عاشقێکی وابوو کە لەرەوێکخستنی هەڵبەست و داهێنانی(نۆتە) دا ! ! و

لە دۆزینەوەی ووشەی لەبارو ئامداردا توانایەکی واق و ورهێنەری هەبوو)[١٨]

– (ئەگە ئەویش وەکوو رۆژ ئاواییەکان کەرەسەی بەزمی ( ساز) و خاوەندی

چەند ئامرازێکی مۆسیقی بایە ، لە گێتی دا یەکەمین هەوا داهێنەر( نۆتێست) دەبوو) .[١٩]

– هەروەها ئەڵێ :–

(وەفایی) لە سەردەمی خۆیدا لە داهێنانی هەوایاندا تاك و بێ وێنە بووە ، هەر دەستە هەڵبەستێکی‌شی چەشنە هەوایەکی تایبەتی هەیە)[٢٠]

● – سەبارەت بە هونەری هەوا دانان و تێکەڵی هۆنراوەکانی ( وەفایی) بە گۆرانیی کوردیی مامۆستا محمد علی قەرەداغی ئەڵێ :–

(ئەوەندە بۆ (وەفایی) بەسە ، کە ئەو هەموو ووشە جوانانەی کوردی بەو ئاوازە خۆشانە بۆ تۆمار کردووین ! ! و کە گوێ لە دەنگی گۆرانی بیەژان ئەگرین کەم وا ئەبێ شیعرەکانی وەفایی‌مان بە (بەستە)و (مەقام) ی دەنگ خۆشانی وەك (مەزهەری خالیقی)و حەسەن زیرەك)و چەندین گۆرانیی بێژی تر لەگوێدا نەزرنگێتەوە)[٢١]

ماموستا هێمن دەڵێ :

( من لە پیرە پیاوانی مەهابادم بیستووە ، (وەفایی) ئەو رۆژەی کە بۆ حەج چووەو نە گەراوەتەوە ئەو غەزەلەی گوتووەو گریاوەو ماڵ ئاوایی کردووە)

(بڵێ پێم گوڵی بەهارم ، لەتۆ تابەکەی جودا بم ؟)

(وەرە ، بەشەرتی جاران ، رۆژێ صەد جارت فیدا بم)

(خاڵی چاوت ، گۆشەی ئەبرۆ ، دوو دینیان کردم لەسەر تۆ)

(یا بمکە پیری مەیخانە ، یا موریدی خانەقایم)

ماویەتی



# بۆ پیربوون چی ی نوێ هەیە؟
# ئایا سەبارەت بەم لایە
# هیچ دۆزراوەیەکی پزیشکی هەیە؟

مجید ندیم وەری گێڕاوە -

پیری بەلایەن زۆر کەسەوە نەخۆشیەکی راستەقینە نیە بگرە خۆی تواناو سروشتی لەشە بەڵام کەمێك هەن کە سەبارەت ئەو کاتە سروشتیەیە پرسیار دەکەن کە پیریێتی تیا دەستی پیێدەکات . سەرژمێرەکان سوورن لەسەر ئەوەی کە مرۆڤی ئەم سەردەمەمان لە چڵ‌وپێنج ساڵاندا پیردەبێ . . بەڵام لێکۆڵینەوە زانیارێکان دەری‌دەخەن کە بەراستی مرۆڤ لە پێش کاتی خۆی‌دا پیردەبێ . . چونکە ئەندامەکانی کەڵکی ئەوەیان پێوەیە نەوەدیان سەد ساڵ گورج‌وگۆلانەو بێ‌ماندوو بوون بژین بەڵام بە پیێی کۆمەکێ مەرج کە بایەخدارترینیان ئەوەیە ئەم ئەندامانە دەبێ خواردن‌و کەرەسەی بنەرەتی بەهێزی خواردەمەنی‌یان پیێبگات . کەواتە لەشی مرۆڤ «پرۆگرامدارە» بۆ ئەوەی ماوەیەکی درێژ بخایەنێ پێش ئەوەی بەلای لاوازی و پوکانەوە دابچێت .

بەڵام وەکو دەردەکەوێ مرۆڤی ئەمرۆ بەجۆرێکی تر «پرۆگرامدارە» بۆیە خۆی بەشداری لە پیربوونی خۆی‌دا دەکات . . لەبەر ئەمە زۆری لێکۆڵینەوە زانیاری‌یەکان خەریکی ئەوەن «بیولۆجیەن» هۆیەکانی پیربوون بزانن . ئەمیش لە تەقەللاداتێکدا کە پەیوەندی بەو چارەسەرکردنەوە هەیە کە رەنگە بێتە هۆی ئەوەی ڕێگەی پیری نەدرێ‌و لەش توانای خۆی پەیدا کاتەوە تاوەکو بەهێز لە کاردابێ . . دیارە نابێت کە ئەوەشمان لە بیربچێت کە هەندێ لایەنی رەچەڵەکی هەیە کە جیاوازی یەکێك لەگەڵ یەکێکی تردا هەیە . هەندێ کەس بەخت‌دارن بەوەی کە لە باوك‌و باپیرانێکەوە هاتوونەخوارێ کە خاوەنی تەمەنێکی درێژ بوون لە ئەنجامی توانای لەشیان وهێزی ئەندامەکانیان‌دا کەوا لە باپیرانیانەوە بۆیان ماوەتەوە ، بەڵام زەلامی تر وانین . . ئەمانەش ئەوانەن کە دەبێ ڕێگەی پیربوون نەدەن .

لەسەرەتادا ئەوە دووپات بکەینەوە کە کاری پزیشکی تا ئەمرۆ دەرمانێکی ئەفسووناوی نەدۆزیوەتەوە تا لاویێتی پیێبگەڕێنێتەوە . بەڵام لێکۆڵینەوەو تاقی‌کردنەوە زانیاری‌یەکان هەنگاوێکی گەورەی لەم ڕێگەیەدا ناوە . . ئەو ئەنجامانەش کە تا ئەمرۆ پیێ گەیشتوون کەڵك بەخشەو چەکێکی کاریگەر پێك‌دەهێنێ کە رەنگە بتوانرێ بەهۆیەوە دە پازدە ساڵ پیری دووابخرێت‌و . . لەم ماوەیەدا دەتوانین کە پارێزگاری توانای لەشی‌و دەروونی‌یەکانمان بکەین‌و بە نیازی چاوەروانی کردن کە کاری پزیشکی بتوانێت لەپاشە رۆژدا ئەنجامی کاریگەرتر وەدی‌بهێنێ . بە شوێن شانەکان‌دا بگەڕێ .

کەواتە بەلای (بیولیجیا)وە پیربوون چی‌یە ؟

لەشی مرۆڤ وەك زانراوە بریتیە لە ژمارەیەکی زۆر شانە کە ئەم شانانەش بەشێوەیەکی سروشتی دەست نیشان‌کراو لەڕێگەی‌دابەش بوونەوە تازە دەبنەوەو لەدایك دەبن بەڵام ئەوەی کە لەگەڵ پیری‌دا دێتەکایەوە ئەوەیە کە ئەم شێوەیە کەم دەبێتەوەو ژمارە شانەکانیش کاتێ کەپیس‌دەبن یاخود کە تووشی نەمان دێن ئیتر ناگونجێن لەگەڵ ژمارەی ئەو شانانەی کە لەدایك‌دەبن ئەمەش لەبەر گەلێ هۆی جۆراوجۆرو دەرکەوتووترینی ئەم هۆیانە وشك‌بوونی ئاوی شانەکان‌و گرژبوونی ئەو دەمارانەن کە دەبنە کۆسپ لەبەر دەمی ئەو گەرانی خوێنەدا کەوا هێزی پێویست بە شانەکان دەدا . . لەم‌لایەنەوە دەتوانین بڵێین ڕێ‌نەدان بە پیربوون بەهۆی پاراستنی کاری شانەکان‌و نەخنکاندنیانەوەیە .

کەواتە چارەسەرکردنی پیریێتی . . خۆپاراستنەو چارەسەرکردنێتی ئەمە بەزۆری بۆ ئەو پیاوو ژنانەیە کە باشن‌و ئەوانەشی کەوا لە تەمەنی ٣٥ ساڵەوە تا پەنجا ساڵەن . . کەواتە پێش ئەوەی نیشانەکانی پیری‌و ماندووبوونی لەش‌و دەروون

دەرکەونو بەر لەوەی پێست لۆچ بێ پێویستە دەست بە خۆپاراستن بکرێ» .

خۆ چارەکردنی زوو (دەبێتە پێویستی) ئەگەر هاتوو لەناو ئەو خێزانەی کە تێیدایت دووپاتی زووتووش بوونی پیریتی کردەوە یاخود باپیران تووشی ئەو نەخۆشیانە بوون کە یارمەتی زوو پیربوون دەدەن بۆ نموونە وەك نەخۆشی شەکر بەلأم لەو کاتەدا ئەوە ناگەیەنی کە چارەسەرکردن دوای دەرکەوتنی یەکەم پلەی پیربوون بەکەڵك‌نایەت . . چارەسەرکردن ئەگەر هات‌و دواش کەوێ لەنەبوون هەر باشترە . . بەلأم ئەنجامەکان ئەوەیە کە لەدەرکەوتن لەم کاتەدا دوادەکەون .

ئەگەر ویستمان رێی پیربوون بگرین یاخود جارێ نەهێڵین بێتە پێشەوە چارەسەرکردن لەلایەن ئافرەتەوە دەبێ لەنێوان تەمەنی چل‌ساڵی وچل‌وپێنج ساڵی‌دا بکرێت‌و لەلایەن پیاوەوە لەنێوان چل‌ساڵی وپەنجاساڵی‌دا بکرێت . . بەلأم کۆتایی‌یەکەی ئەوەیە کە هەموو شت دەگەرێتەوە بۆ تەندرووستی زەلامەکەی کەوا تووشی چارەسەرکردن هاتووە .

دەبێ یەکەمجار بڵێین . . چارەسەرکردن دەبێ بەوپەری هێواشی‌و لەسەرخۆیی‌بەوە بکرێت وپێش ئەوەشی کەدەستی پی‌بکەیت باشتر وایە کە بە شێوەیەکی گشتی خوێن‌و هەردوو سی‌و دڵ‌و دەمارەکان‌و گورچیلەکان پیشانی پزیشك بدەیت‌و ئەمەش بۆ دوورخستنەوەو بەربەست‌کردنی هەموو کارێك کە لە ئەنجامی چارەسەرکردن‌دا روودەدەن‌و ئێش بە لەش دەگەیەنن . . لەکاتی دەست‌پی‌کردنیشدا دەبێ دووپاتی چارەسەرکردنی بی‌وچان بکرێتەوە . . ئەمەش بە گوێرەی کاتەو یەکەمیان سێ مانگەو دووەمیان دەگاتە دەمانگ بەلأم دەشێ کە چەند جارێك نوێ بکرێتەوە بێجگە لەوەی کە پێویستە بەساڵێك یان بەدوو ساڵ بەگشتی بەگوێرەی حاڵ خۆت پیشانی پزیشك بدەیت . . هەروەها لە رێگەی تاقی‌کردنەوەشەوە ماوەیەك نەبێ کە سێ یان پێنج ساڵ دەخایەی لەزۆر حاڵەت‌دا دەرناکەوێ .

چارەسەری پێشنیارکراو ، کەواتە هەموو لەش دەگرێتەوەو مەبەستەکە ئەوەیە کە شانەکان هەموو بەکاروباری خۆیان باش هەڵدەستن چونکە یەکێك لە هۆ بنچینەی‌یەکانی پیربوون وشك‌بوونی شانەکانە ، واتە شانە ئاوی نامێنێ ، لەگەڵ ئاونەمانی شانەکەدا رەگەزە سەرەکی‌یەکان بۆ دروست‌بوونی وەك ڤیتامینات‌و هۆرمۆنات نامێنن ، ئەو لێکۆڵینەوانەی کە پەیوەندیان بەم کارەوە هەیە دەریان‌خستووە کە وشك‌بوونی شانەکان زوو دەست‌پی دەکات (لەتەمەنی چل ساڵی‌دا) و لەهەموو زەلامێك‌دا بە چەسپاو بەرەو ژوور دەبێتەوە .

أ کەمی ئاو :

لەشت چۆن ئاو دەدەیتەوە ؟ ئەمەش بەدوورخستنەوەی لە هەموو ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی وشك بوونی وەکو خۆدانە بەرخۆرو گەرمی زۆرو سەرمای بەهێز . . ئەم کارەش بەرێگەیەکی زۆر ئاسانتر دەبێ کە ئەویش ئاوخواردنەوەیەو بەشێکە لەچارەسەرکردنەکە . وەك رووەکێك لەشیش دەبێ ئاو بدرێت‌و پێویستە کە فێربین هەموو بەیانیانێك لە خورێنی پەرداخێکی گەورە ئاو بخۆینەوەو پێش هەموو ژەمێکی خواردن پەرداخێکی گەورە ئاو بخۆینەوە .

ب - کەمی ڤیتامینات

لێکۆڵینەوەکان دەریان خستووە کە کەمی ڤیتامینات هەمیشە لەو زەلامانەدا دەردەکەوێ کەوا تەمەنیان لەچل ساڵی تێپەریوە .

ئەم کەمیەش بە گوێرەی لەشی زەلامێك و زەلامێکی تر دەگۆرێ‌و لێکۆڵەرەوەکان وایان لەقەڵەم‌داوە کە دوای ئەو تەمەنە پێویستمان بە ڤیتامین چەندە ئەوەندە زیاد دەکات .

لێرەدا ئەم پرسیارە دەکرێ : دەبێ بەوەندە ڤیتامین قایل‌بین کەوا خۆراك‌و خواردن دەماندەنێ ؟ وەلأم دیارە نەخێر . . کەواتە دەبێ هەندێ خۆراك زیاتر بخۆین‌و پێویستیشە بە شێوەیەکی دووپات کراوە دووبارە پەنا بەرینە بەر ڤیتامینە پێکهاتووەکان .

دەتوانین ئەو ڤیتامینە سروشتیانە بەکاربهێنین کە لە خواردنەکان‌دا هەن . . بەلأم دوو جۆر ڤیتامین هەن کە رێگەی پیربوون بگرن ئەوایش ڤیتامین (A) ئەی‌و ڤیتامین (E) ئی‌یەو دەتوانرێ بخورێن یان بەجیاو یاخود تێکەڵ‌بوون کە بەڤیتامیناتی تری وەك (A B.CE) ئەی بی ، سی ئی دەکرین .

ڤیتامین (A) ئەی پێویستی بۆ مژینی پروستات‌و دامەزراندنی لە لەش‌داو بۆ پاراستنی حاڵەتی چاکی پەیکەری ئێسك و بناغەنانی دەزولکەکان دەورێکی چاك دەبینێ . . بەتایبەتی پێست‌و بینایی لەدوای تەمەنی چل ساڵی‌یەوە دەپارێزێ ، لە دوایی‌دا ڤیتامین (A) ئەی بۆ ئێش‌کردن یارمەتی هەندێ لووش دەدات وەك (لووی) نخامی (الغدد النخامية) . . هەروەها لێرەش‌دا بەشداری چارەسەرکردنی لووی بی‌دەنگ (الغدد الصماء) دەکات .

ئەم ڤیتامینە دەتوانرێ پێش تەمەنی چلّ ساڵی بەهۆی ئەوخواردنانەوە ئەوڤیتامینەی زۆر تێدایە کەڵکی لیٚوەربگیرێ وەك جگەری گوێرەکەو باڵندەی هێلکەکەرو رۆنی جگەری ماسیو هەندێك سەوزەی وەك شێلمو سپێناخو گوێزەرو هەنجیری دێمیو هەندێ زەردباوی وەك هەڵوژەو قەیسی .

بەلاّم دوای چل‌ساڵی وئەنجامی پێویستی زۆر بە ڤیتامین (A) ئەی ئەگەر وەك حەب بخورێ ئەوا بۆ پیاوو ژن وەك یەك کەڵکی زۆری دەبێ . . پێست لە لۆچ‌بوون دووردەخاتەوە ، دیسانەوە دەتوانرێ ڤیتامین (A) ئەی سرووشتی کە پلەی زۆر گەورەی هەیەو لە جگەری ماسی (موری) دا دەرهێنراوە ئەویش بە پیٚ‌ی ۲۰ تا ۵۰ هەزار لە رۆژێکدا بەکاربهێنرێ . بەلاّم ڤیتامین (E) ئی دژی ژەنگ‌هێنان . . ئەمە ئەوکارە گەزانە رادەگرێ کەوا ئۆکسجین لە هەندێ کەرەسەی بنەرەتی لەش‌دا درووستی دەکات . . لە بەر ئەوە کەواتە ریٚ لە پیرێتی دەگرێ .

• لەراستی‌داو لەسەرچاوەی هەندێ لەشی رۆن‌دارەوە ئۆکسجین دەبێتە هۆی پەیدابوونی کەرەسەی ژەنگ‌دارو زیان بەخش‌و دەتوانرێ کە بە کەرەسەیەکی بۆ گەن لە قەڵەم بدرێو ڤیتامین (E) ئی‌ی دژی ژەنگ هێنان دەتوانیٚ قەدەغەی درووست‌بوونی ئەم لەشە رۆندارانەو کەڵەکەبوونی لە خوێن دا بکات . بە شێوەیەکی‌تر رێگەی گرژبووی دەمارەکان نادات‌و کاری گەرانی خوێن لە دەمارەکان (تاجی) دا ئاسان دەکات بێجگە لە گورج‌وگۆڵ کردنەوەی ماسوولکەکانی دڵیش .

ڤیتامین (E) ئی کارێکی باشتری هەیە کە ئەویش ئەوەیە کاریگەرێتی ڤیتامینەکانی تر پتەودەکات ئەمەش خواردنێی بە شێوەیەکی رێك‌وپێك وەك حەب . . رۆژانە لە نێوان ۵۰۰ تا ۸۰۰ میلگم‌دا بەکاردەهێنریٚو هیچ مەترسی‌یەکیش بۆ سەر لەش‌ساغی پەیدانا‌کات‌و رێگەی پیری دەگرێت‌و گورج‌وگۆڵی ژیان درێژە پیٚ‌دەدات . . ئەو خواردنانەش کە بەم ڤیتامینانە دەوڵەمەندبن . . رۆنی رەگی گەنمەو رۆنی خورماو بندق‌و بادەم‌و کۆلزاو (کەروەکێکی رۆندارە) گەنمەشامی‌و فستق‌و زەیتون‌و (هلیون)ی بەری (ئڤوکادۆ)یە .

## ج – کەمی کەرەسە بنەرەتی‌یەکان

کەرەسە بنەرەتی‌یەکان بەشێك درووست دەکەن لەو کەڵکانەی کەوا دەوری شانەکانیان داوەو ئەو رەگەزانەش کە ئەمە لێیان درووست‌دەبیٚ ئاسن‌و مس‌و کوبالت‌و پۆتاسیۆم‌و زەنگ‌و یۆدە . . گەلیٚ جار بۆ خۆ پاراستن لە نەخۆشی پەنادەبرێتە بەر ئەم کەرەسانە بۆ گورج‌کردنەوەی بەرگری کردن دژی نەخۆشی . . دیسانەوە کەوا بۆ رێگەنەدان بە پیربوون زۆر پێویستە مانگانیزو کۆبالت (بەتایبەتی) ماینویۆم‌و کە بەشداری خاوبوونەوەی ماسوولکەکان بەتایبەتی هی دڵ دەکات . . سەرباری ئەمانەش بۆ سەرشانەکان کارێکی گورجی هەیە بەتایبەتی لەپەردەی ئەو شانەیەی کە دەورێکی کاریگەری هەیە وەك هۆی یەکدگیری نێوان گەرای شانەو هەموو شانەکانی‌تر . . هەروەها ماینزیۆم بەرەنگاری (نقلون)ی خوێن لە کەژی شانەکان‌دا دەوەستیٚو پارێزگاری لەنگەری راگرتنی ترشەڵۆك مسۆگەر دەکات . . دەتوانرێ وەك حەب رۆژی جارێك یان دوو جار بەکاربهێنرێ ئەمەش بە بارستەی (۲۵) تا (۵۰) میلگم لەرۆژێك‌داو بە پیٚ‌ی پێویست دەبیٚ .

پێویستە باش بزانرێ کە بوونی شەکرو بەز لە خوێن داهۆیەکی گەورەیە بۆ زوو پیربوون . . چونکە دەبێتە هۆی گرژبوونی دەمارەکان هەروەها مەترسی تریشی هەیە وەك کەم‌خوێنی . . لەبەر ئەوەو بۆ دوورخستنەوەی پیربوون پێویستە هەندێ دەرمان بەکاربهێنرێ کە دەبنە هۆی کاری رێکخستنی دەربازبوون لەبەزو شەکری زیادە بەتایبەتی دوای چلّ ساڵی . ئەم دەرمانانەش کاری دوولکانە دەگێرن .

● **دەربازبوون لە رۆندارو شەکر لە کاتی درووست بوونیا لە شانەدا .**

● **بەرەنگار دەستانی ئەو پەشێویانەی کە ئەنجامی خەست بوونی خوێن یان (جەڵطە) درووست دەبن کە دەبێتە هۆی پەیدابون‌و دەست نیشان کردنی بوونی رۆنداری لە خوێن‌دا .**

لەکۆتایی‌دا . . ئەگەرێینەوە بۆ دووپات‌کردنەوەی ئەو چارەسەریانەی کەناومان بردن . . بە شێوەیەکی گشتی بۆ دوورخستنەوەی پیری‌و درێژە پێدانی لاوی‌یەو چاوەروانی ئەوەشە کە دەستی پزیشکی دەیگاتیٚ لە دۆزینەوەی ئەو دەرمانانەدا کە وتەی شاعیری لەگەڵ‌دا ریٚبکەویٚ «خۆزگە رۆژێك لاویم دەگەرایەوە . . » .

**لەگۆڤاری (الوطن العربي)**
**ژمارە (۱۹۹)ی ساڵی ۱۹۸۰**
**وەرگیردراوە**

# خەون لە ژێر تیشکی سایکۆلۆژی زانستی دا

ئاری بابان .

لە نێوان ئێمەدا راڤەکردنی واتای خەون شتێکی زۆر ئاسایی یە بەڵکو زۆر جار خەڵکی خەونی خۆیان دەگێرنەوە تا وەکو بتوانن پێزانین لەو رووداوانە بکەن کە هێشتا روویان نەداوە بەڵکو لە داهاتوویەکی نزیك وەیا دووردا روو دەدات ، ئەگەر بێتو بە چاوێکی مەوزوعی نەك تەنیا تەماشایەکی راڤەکردنی ئەو خەونانەبکەین کە لە نێوانماندا باوە دەبینین بڵاوبوونەوەی بیری ئایدیالی بەشێوەیەکی زۆر فراوان کاری کردۆتە سەر رەوشتو بەشێوەیەکی زۆر رایەکانمان ، ئەو بیرو باوەرە ئایدیالی یە بەشێوەیەکی زۆر ناهەموار رەگی داکوتیوەو لە نێوانماندا تەشەنەی کردووە .

راڤە کردنی خەون بەم شێوەیە لە مێژووەیە بۆمان ماوەتەوە ، لەو سەردەمەی زانستی یەکی سەرەتایی هەبووە خەڵکی پەنای بردۆتە بەر بیری ئایدیالیو وای دادەنا کە هێزێکی شاراوە هەیە بەو رووداوانە هەڵدەستێ کە هێشتا زانستی نەیدەتوانی راڤەیان بکات ، بەڵکو زانستی ئەو سەردەمەش لەسەر بناغەیەکی ئایدیالی دروست کرابوو .

راڤەکردنی خەون بەم شێوەیەی لەنێوانماندا باوە کە رووداوەکانی دەبەستنەوە بە داهاتووەوە لە سەردەمی یونانەکانەوە بۆمان ماوەتەوە ، هەر وەکو هۆمیرۆس باسی کردووەو دەڵێت ، خواوەندەکان خەون بەکار دەهێنن بۆ ئەوەی ئامۆژگاری یەکانیان بگەیەننە خەڵکی ، کەواتە لەو سەردەمەدا خەڵکی وایان دەزانی کە ئەو خەونانەی دەیبینن لە لایەن خواوەندەکانەوە بۆیان هاتۆتە خوارەوە تا وەکو بەپێی خەونەکە هەڵسوکەوت بکەن ، لە شاری ئیسپارتەدا چەندین پیاوی ئایینی هەبوون لە پەرستگاکاندا دەخەوتن بەتایبەت بۆ ئەوەی خەون ببیننو ئەو ئامۆژگاری یانەی وەکو سروش بۆیان دێتە خوارەوە بیگەیەننە خەڵکی ، بەلام ئەرستۆ رایەکی جیاوازی بۆ دەرکەوتبوو وە دەیووت هیچ پەیوەندی یەك نی یە لە نێوان خەونەکانمانو خواوەندەکاندا ، بەڵکو ئەو خەونانەی دەیبینین تەنیا کارکردنو چالاکی یەکی دەروونی یە لە کاتی خەودا ، هەروەها دەیووت ئەو مونەبیهاتانەی لەکاتی خەودا کار دەکەنە سەر خەوتووەکە خەون دەبکات بە وێنە ، بۆ نموونە سەیر دەکەین لە خەوندا لە ناو ئاگرێکداینو دەسوتێین وەیا ئاگرێکی گەورە تووشمان بووەو رێی پێ گرتووین خوشی لە راستیدا تەنیا ئەندامێکی لەشمان تۆزێ گەرم بووە ، ئەرستۆ خەون دەگێرێتەوە بۆ ئەو شتانەی کارمان تێ دەکات لە کاتی خەودا نەك بۆ ئەو چالاکی یەی بە رۆژ پێی هەڵدەستین .

تاوەکو ئێستاش خەون جۆراوجۆر لێك دەدرێتەوەو ئەو لێکدانەوەیەش زۆر دوورە لە راستی یەوە ، بەتایبەت بەلای سایکۆلۆژی زانستی یەوە کە (بافلوف) پاش تاقیکردنەوەیەکی زۆر بناغەیەکی پتەوی بۆ دانیو بێتە زانستی ترین قوتابخانەی سایکۆلۆژی کە بە هەموو جۆرێك زانیاری پاڵپشتی دەکاتو دەیسەلمێنێت .

لە لایەکی تریشەوە قوتابخانەیەکی کە دەیویست زیاتر بیری ئایدیالی بچەسپێنێو مرۆڤ وا لێ بکات لە بیری خۆیدا بۆ نەخۆشی یەکانی بگەرێت ، ئەمەش وای لێ کردووە کە دەورێکی ناهەموار بگێرێ هەوڵ دەدات بەرەو ناوخۆمان برۆینو خۆمان وون بکەین بەڵکو وامان لێ دەکات کە لە دەروونی خۆماندا بە دوای تەنگ و چەڵەمەکانماندا بگەرێین ئەمەش هوشیاریمان کەم دەکاتەوە لە بەشداری کردنمان لەو تێکۆشانەی دەکرێت دژی هۆیە سەرەکی یەکانی ئەو تەنگو چەڵەمەیە ئەوەش چەوساندنەوەیە بە هەموو جورێکی .

با لێرەدا بەکورتی باسێکی ئەوە بکەین کە چۆن (بافلوف) بە تاقیکردنەوەی زانستی یانە سەلماندی رێبازەکەی (فرۆید) رێبازێکی زانستیانە نی یەو خزمەتی لایەنێکی دیاریکراو

دەکات ، بۆیە دەبینین بیروراکانی (فرۆید) بەشێوەیەکەی زۆر فراوان بلاْوبۆتەوە بەتایبەت لە وولاْتە سەرمایە دارەکاندا ، بێگومان ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو بیروباوەرانەی (فرۆید) دەری دەبریْو خزمەتی ئایدەولوژیایەکی تایبەتی پیْ دەکاتو بەهەموو جۆرێك هەولْ دەدات بیسەلمیْنیْو پالپشتی بکات .

ئەوەی ئیْمە لیْرەدا مەبەستمانە تەنیا خەونە بەلای ئەوەوە ، خەون هەروەك فرۆید دەبینێت لە ئارەزویەکی شاراوەوە یا چەپکراو دەردەبرێت کە نەمانتوانیوە لە ژیانی رۆژانەماندا بهێنینە دی وە ئەو ئارەزووانەش لەسەرەتای دروستبوونیەوە ئارەزووی سێکسە ، بەلْکو دەگەرێتەوە بۆ قۆناغی منداڵی ، لەوکاتەی ئارەزووەکانمان دەکرد لەبەر ئەوەی بەتاوانمان دەزانی ، بەرای فرۆید لە خەونەکانماندا ئەو ئارەزووە سێکسییانە دەردەکەونو دەیانەویْ لە خەوندا بێنە دی .

بەلاْم دەبینین هەموو کاتێك مرۆڤ خەونی سێکس نابینێت بەلْکو زوربەی خەونەکانمان رووداوێکی ساکاری رۆژانەیە کە زۆرجار لە یادمان نامێنیْ . فرۆید لیْرەدا دەلْێت هەتا ئەو خەونانەش سێکسی‌یە بەلاْم بە شێوەیەکی رەمزی دێتە دیو دەیبینین . لە هەمووی سەیرتر فرۆید وای داناوە هۆی شێواندنو نەبوونی پەیوەندی لە نێوان خەونەکانماندا دەگەرێتەوە بۆ منی بەرز (انا الاعلی کەوەك رەقیب وایە بەسەرمانەوە هەر ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی خەونەکانمان شێوەیەکی رەمزی بگرنە خۆیان . هەروەکو (فروید) دەلْیت ،بەلْکو بتوانن بە رەمز لەو ئارەزووانە دەربرن . ئەم بیروڕایانەی فرۆیدو قوتابی‌یەکانی دەربارەی خەون پیْی دەووتریْ (تیوورە سکسی‌یەکان لە راڤەکردنی خەون) .

پێویستە شتێکی گرنگمان بیر نەچێت کە لەو کاتەی فرۆید ئەو رێبازەی داناوە زانستی فسیۆلۆژی لە سەرەتای پەرەسەندنی بووە .

بەلاْم پاش ئەوەی زانستی فسیۆلۆژی پەرەی سەند بافلوف توانی هەلْەکانی فرۆید روون کاتەوە رێبازە راستیەکەمان بۆ دەربخات ئەم رێبازەی بافلوف تەواوکەری تاقی‌کردنەوەکانی «سیگنۆڤە» (١٨٢٩ – ١٩٠٥ ) کە توانی سیمای سایکۆلۆژی ماتریالی دەستنیشان بکاتو بافلۆفیش بە هەولْو تاقی‌کردنەوەیەکی زۆر توانی بناغەی سایکۆلۆژی ماتریالی پتەوتر بکاتو زانستی فسیۆلۆژیبکاتەبناغەی ئەو سایکۆلۆژی‌یەو دوورمان بخاتەوە لە سایکۆلۆژی ئایدیالیو بیری خۆیەتی .

خەون بەلای سیگنۆڤەوە تێکەلاْوبوونێکی نائاسایی‌یە لەنێوان ئینتباعاتی پێشووماندا ، ئەم رایەی سیگنوڤ ، بافلۆف هەولْی‌دا بەتاقی‌کردنەوە بیسەلمێنیْو رووونی بکاتەوە ، هەروەها شتی زۆرمان بۆ روونبکاتەوە دەربارەی خەون .

بۆ یەکەم جار بافلۆف توانی لە ژووری تاقی کردنەوەدا خەونی دەستکرد درووست بکات ، لە رێگای مونەبیهاتی دەنگدارەوە وەیان بەهۆی مونەبیهاتی تایبەتی تر بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاری دەکرد سەر هەستەکانی ئەو کەسەی دەیخەواند .

بافلۆف بۆی دەرکەوت کە ئەو خەونانەی بەکارکردنی ئەو مونەبیهاتانە دروست دەبێت رەنگ‌دانەوەی ئەو ئیشارەتو مونیهاتانەیە کە بەکارمان هێناوە بۆ دروست‌کردنی خەونەکە .

هەروەکو لە یەکێك لە تاقی‌کردنەوەکانی ئافرەتێکی خەوانو مونەبیهاتی دەنگداری بە هەستەکانی‌یەوە بەستەوە ، لەپاش شاور لیْ‌دانێك لەناو ژوورەکە ، هەروەکو ئافرەتەکە گێرایەوە لە خەونیا لە ئیستگەی شەمەندەفەر وەستابوو شەمەندەفەرێك بەرەولای بە شاورلیْ‌دان دەهات ، کە دووەم جار شاوری لیْ‌دایەوە ، ئافرەتەکە لە خەونیا بینی شەمەندەفەرێکی کە لە لایەکی ترەوە بە شاورلیْ‌دان بەرەو لای دەهات . لیْرەدا دەبینین خەونەکەی رەنگ‌دانەوەیەکی تەواوی ئەو مونەبیهاتانەیە کە بۆی دەنێرن .

با بێینە سەر باسی چۆنیەتی لێکدانەوەی راڤەکردنی خەون بەلای بافلۆفەوە پاش تاقی‌کردنەوەیەکی زۆر پێرەوکردنی زانستی فسیۆلۆژیو بەستنەوەی بە سایکۆلۆژی‌یەوە .

بەرای بافلۆف چەند هۆیەك هەیە دەورێکی سەرەکی‌یان هەیە لە دەستنیشانکردنی ناوەرۆکی خەونەکانماندا ، ئیْستا با بزانین ئەو هویانە چین کە خەونەکانمان پێك دێنن؟؟

ئەو هۆیانە دەبنە دوو بەشی سەرەکی‌یەوە ، یەکەمیان هۆیەکانی دەوروبەری خۆمانە کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ کارمان تیْ دەکات ، وەکو ئەو تێروانینانەی کە ماوەیەکی زۆر نی‌یە هۆشمان لە دەورو بەرمانەوە وەری‌گرتووە ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو کاروبارانەی لە ژیانی رۆژانەماندا پیْ‌ی هەلْدەستینو ئەو کارەوبارەی بەرۆژ پیْ‌ی هەلْدەستین زۆر جار دەبێتە ناوەرۆکی خەونێکمان ، هەروەکو لە زووربەی خەونەکانماندا دەبینین بە کاروباری رۆژانەمان هەلْدەستین بەلاْم بەشێوەیەکی شێواو ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی مرۆڤ هەرچی‌یەك ببینیْ وەیا گوێ‌یْ لیْ‌بێت وەیا بیخوێنیتەوە وەیا بیری لیْ‌بکاتەوە لەسەر رووی مێشکی شوێن بەجیْ دێلێتو هیچ دوور نی‌یە ناوەرۆکی خەونێکمان پێك‌بێنێت .



زۆر جاری وا هەیە مرۆڤ شتێکی سەرپێی دەبینێت هیچ سەرنجی راناکێشێت وەیا ڕزوداوێکی زۆر بچووك دەبینێو هەر ئەو ساتە لەیادی دەچیتەوە بەلاّم سەیر دەکەین ئەو ڕووداوە بچووکە لەکاتی خەودا دەبێتە ناوەرۆکی خەونێکمان هەر وەکو ووتمان لەبەر ئەوەیە کە لەسەر ڕووی مێشك شوێنی خۆی بەجێ هێشتوزە .

یان زۆرجار یادگاری‌یەکی زۆر کۆن ئەگەر هی کاتی منالێش بێت ، هەر پاش ماوەیەکی کەم بەسەر ڕووداوەکەدا تێپەربووبێ لەبیر چۆتەوە کەچی دەبینین ناوەرۆکی خەونێکمان پێك دێنێت .

هۆیەکی زۆر گرنگ هەیە کە ئەو یادگارە کۆنەمان وەبیر دێنێتەوە کە لەگەل ئەوەی لەبیرچۆتەوە کەچی لە خەون‌دا دەبینین ، ئەو هۆیەش پی‌ی دەوترێت (تداعي) لە ئەنجامی (تداعي) بیرەکانمانەوە تەماشا دەکەین بەهۆی ڕووداوێکەوە چەندین ڕووداوی دیکەمان دێتەوە بیر ، زۆر جاری وا هەیە تەنیا پەیوەندی‌یەکی ناڕاستەوخۆ ئەو ڕووداوانە بەیەکەوە دەبەستێتەوە . بۆ نموونە هەر یەك لە ئێمە دەبینین لە کاتی ئیش‌کردن‌و ژیانی ڕۆژانەماندا بەهۆی شتێکی تایبەتی‌یەوە چەندین ڕووداوو شتی دیمان دێتەوە بیر بی‌گومان ئەو شتانەش وەیا ئەو ڕووداوانە ڕزوداوی رابردووە ، بەلاّم ئەو شتە وەیا ئەو ڕووداوە ساکارەی ژیانی ڕۆژانەمان دەبێتە مونەبیهێك‌و ئەو ڕووداوانەی دی زیندوو دەکاتەوە کە پەیوەندی‌یەکی ئەوتۆی لەگەلّدا هەیە .

بۆ نموونە رەنگە لەکاتی کاروباری ڕۆژانەماندا شتێك بکەوێتە سەر زەوی‌و دەنگێکی تایبەتی دروست بکات ڕەنگە ئەو دەنگە شتی وامان بێنێتەوە بیر کە تەنیا لە دەنگەکەدا پەیوەندی‌یان پێکەوە هەیە وەك ئەوەی کارەساتێکی ناخۆشمان بێنێتەوە بیر ، لەکاتی ئەو ڕووداوەدا گوێمان لە دەنگێکی وا بوو وە ئەو کارەساتەش ڕووداوی ترمان وەبیر بێنێتەوە ، بەم جۆرە زۆر شتمان وەبیر دەکەوێتەوە بەهۆی ئەو دەنگە تایبەتی‌یەوە ئەو هەموو



یادگاری‌یەی لەو ساتەدا وەبیرمان هاتەوە رەنگە پاش چەند ساتێك بەهۆی کاری رۆژانەوە لەیادمان بچێتەوە بەڵام دوور نی‌یە یەکێك لەو هەموو رووداوە ببێتە ناوەرۆکی خەونێکمان ، هەروەکو زۆر جار خەڵکی خەون دەبینن‌و دەڵێن بیرمان لەو شتە هەر نەکردۆتەوە بەڵام ئەگەر لێ‌ی بکۆڵینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ڕووداوێك یان شتێکی بچووك لە ڕووداوێکدا پەیوەندی هەیە بەو خەونەوە .

هەروەها دەتوانین بڵێین هیچ مرۆڤێك نی‌یە بتوانێ بە ووردی بزانێ لە بەیانی‌یەوە تاوەکو کاتی خەوتنی بیری لە چەند شت کردۆتەوە وە چەند شتی بینیوە وەیا گوێ‌ی.لە چەند ووشە بووە ، ڕەنگە ووشەیەك وامان لێ بکات رووداوێکی زۆرمان بێنێتەوە بیر .

کەواتە دەتوانین بڵێین خەونەکانمان شارەزایی‌و زانیاری ڕابردومانەو بەهۆی مونەبیهێکی تایبەتی‌یەوە لە ساتێکی دیاری کراودا وەبیرمان هاتۆتەوە .

بۆ نموونە ئەگەر لە خەونێکماندا لە کتێبخانەیەکدا بین . لێرەدا بێ‌گومان ئەو شوێنەی لە خەونەکەدا بینومانە وەیا ئەو ڕووداوەی لە خەونەکەدا رووی داوە ، شارەزایی‌یەکی ئەوتومان دەربارەی هەیە وەیا بەلای کەمەوە شتێکی سەرپێ‌ی دەربارەی ئەو شوێن‌و رووداوە دەزانین وەیا بیستومانە . بۆ نموونە هیچ کاتێك نەبووە یەکێك زۆر لە شارستانی‌یەتەوە دوور بژێت و هەر نەیبیستبێ شەمەندەفەر چی‌یە وەیا هەیە ، خەون بە شەمەندەفەرەوە ببینێت .

هۆیەکی دی هەیە کە دیسانەوە کارمان تێ دەکات بەهۆی دەوروبەرمانەوە بەڵام بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ ، ئەمەش ئەو بیروڕایانە دەگەیەنێت کە لە مێشکماندا کۆ بۆتەوە ، بەڵام ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێ‌پەریوە .

ئەو بیرو تێ‌ڕوانینانەی لە مێشکماندا هەیە وەیا ئەو شارەزایی‌یەی بە درێژایی ژیانمان لە دەوروبەرەوە وەرمان گرتووە

سەرچاوەیەکی زۆر گرنگە لە پێکهێنانی خەونەکانماندا ئەو شارەزایی‌یانەمان ، لە خەوندا دەبن بە وێنەو ئەو وێنانەش هەمان هەستو سۆزمان دێنێتەوە یاد کە لە کاتی ڕوودواوەکەدا هەستمان پێی کردووە .

هۆی دووەم کە هەمیشە خەونی سامناكو ناخۆشمان بۆ پێك‌دێنێ ئەو مونەبیهاتانەیە کە خۆمان سەرچاوەکەیین . ئەم جۆرە خەونە بەهۆی چەند دیاردەیەکی فسیۆلۆژی زانراوە وە دروست دەبێت ، بە زۆربە ڕوودواوەکانی ناخۆشن‌و اکارەساتی ترسناکی تیادا دەبینین .

ئەو دیاردە فسیۆلۆژی‌یانەش وەك زۆر خواردن لەپێش خەودا ، وەیا پربوونی میزەڵدان وەیا شوێنی خەوتن . هەروەها جۆری خەوتن چونکە جۆری خەوتن زۆر جار توشی هەناسە تەنگیمان دەکات وەیا بەگران لە لەشماندا خوێن دەسوڕێتەوە بە تاقیکردنەوە زانراوە کە ئەو . خەونانەی سامناکن وەیا پڕن لە کارەساتی ناخۆش ، لەو کاتەی دڵمان لەسەر بارێکی تەواو نی‌یە ڕوودەدات . چونکە ناتوانێ ئیشی خۆی بەباشی بگێڕێت . هەروەها ئەو خەونانەی دەبینین وا خەریکە دەخنکێین ئیتر ئەو خنکاندنە بەهەر جۆرێك بێت . لەو کاتەدا ڕوودەدات کە لەکاتی خەودا بەگران هەناسە دەدەین لەبەر ئەوەی هەناسەدانمان لەبارێکی تەواودا نی‌یە .

ئێستا با بزانین خەون بۆچی وا بە شێواوی دەبینین‌و هیچ پەیوەندی‌یەکی تەواو نی‌یە لەنێوانی ڕوودواوەکانی‌دا؟؟

(باڤلوف) توانی بە پەیرەوکردنی ڕێگای زانستی‌یانە راڤەکەی فرۆید پوچەڵ بکاتەوەو بیسەلمێنێ کە شێواوی خەون هۆیەکەی ئەوە نی‌یە کە خەونەکانمان پەنا دەبەنە بەر ڕەمز تاوەکو لە خویان دەربرن بەڵکو هۆیەکی فەسلەژی هەیە وا لە خەونەکانمان دەکات شێواو بێت .

مێشکی مرۆڤ دەبێتە دووبەشەوە بەشێکیان پێی دەووترێ «کۆمەڵەی ئیشارەتی یەکەم «وەیا» کۆمەڵەی ئیشارەتی لوغەوی»- بەشەکەی دی پێی دەوترێ «کۆمەڵەی ئیشارەتی دووەم»وەیا .«کۆمەڵەی ئیشارەتی هەستەکان .

کۆمەڵەی ئیشارەتی یەکەم مەسئولی هەست‌پێ‌کردنی شتەکانی دەوروبەرمانە ئیتر بەشێوەی وێنە بێت وەیا دەنگ بێت وەیا . . . هتد بەڵام کۆمەڵەی ئیشارەتی دووەم مەسئولی لێکدانەوەو رەخنەگرتن‌و هەڵسەنگاندنی ئەو شتانەیە کە هەستی پێ دەکەین .

ئێمە دەزانین کۆمەڵەی ئیشارەتی دووەم لەبەر ئەوەی زۆر ناسکەو بە درێژایی ڕۆژ شت لێك‌دەداتەوەو هەڵی دەسەنگێنێ لەپێش بەشەکانی تری مێشکدا دەخەوێت بەڵام کۆمەڵەی ئیشارەتی یەکەم بە ماوەیەك دوای کۆمەڵەی ئیشارەتی دووەم دەخەوێت ئەو ماوەیەی لەنێوان خەوتنی کۆمەڵەی یەکەم‌و کۆمەڵەی دووەمە خەوەکەمان سوکەو هێشتا قوڵ نەخەوتوین .

هەروەکو زانستی فیسولۆژی سەلماندی ئەو کاتەی لە نێوان خەوتنی ئیشارەتی لوغەوی‌و ئیشارەتی هەستەکانە ئەو ماوەیەیە کە خەونی تیا دەبینین . بۆ نمونە سەیر دەکەین هەمیشە لەو کاتەدا خەون دەبینین کە ماوەیەکی کەمە خەوتوونی وەیا کاتی بەیانیان پێش ئەوەی بەخەبەر بێین .

کەواتە لەو کاتەی خەون دەبینین کۆمەڵەی ئیشارەتی دووەم بەتەواوی خەوتووەو توانای لێك‌دانەوەو هەڵسەنگاندنی شتی نەماوە . بەڵام کۆمەڵە ئیشارەتی یەکەم لە نیمچە خەو دایە ، هەر کە مرۆڤ خەون دەبینێت بەهۆی ئەو مونەبیهاتانەی لەسەرەتادا باسمان کرد . ئەو شوێنەوارانەی مونەبیهەکە کاری تێ‌کردوون دەبنەوە بە وێنەو هەستی پێ دەکەین بەڵام لەبەر ئەوەی کۆمەڵەی ئیشارەتی دووەم توانای لێك‌دانەوەو رەخنەگرتن‌و بەستنەوەی وێنەکان بە یەکترەوەی نەماوە ، دەبینین خەونەکانمان پەیوەندی نی‌یە پێکەوەو بەشێواوی دەیبینین . بەڵکو بەهۆی نەبوونی پەیوەندی‌یەوە سەیر دەکەین خەونی زۆر سەیر دەبینین .

هەر وەکو زانیمان هۆیەکی فەسلەژی هەیە کە خەونەکانمان دەشێوێنێ نەك وەکو (فرۆید) دەڵێت خەون پەنا دەباتە بەر رەمز لەبەر ئەوەی – منێ بەرز – (انا الاعلی) وەك رەقیبێك چاودێری ئارەزووەکانمان دەکات ، ئەمانە هەمووی بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە خەون بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی بە داهاتووە نی‌یەو هەرگیز ناتوانێ پێزانی لەو ڕووداوانە بکات کە هێشتا ڕوویان نەداوەو چاوەڕوان ناکرێت ڕوو بدات .

بەشێوەکی‌تر دەتوانین بڵێین کە خەون هیچ شتێکی سەیری تێدا نی‌یە چونکە خەونەکانمان تەنیا ئیشی ڕۆژنەی خۆمانە وەیا بەشێوەیەکی زۆر سەر پێش بێت ئەوا یان بیرمان لی‌کردۆتەوە وەیا بیستومانە .

ئەمانە هەمووی دەیسەلمێنی کە خەون ڕوودواوێکەو لە رابردوودا ئەگەر لە مێشکیشمان‌دا بێت ڕووی داوەو هیچ پەیوەندی‌یەکی بە داهاتووەوە نی‌یە .

ئەم راستی‌یە دەربارەی خەون ئەو کەسانەی لە سەرەتای ژیانیانەوە کوێرن وەیا کەرولاڵن بەتەواوی دەیسەلمێنن . هەر وەکو

لە چەندین تاقی‌کردنەوەدا دەرکەوتووە ئەو شتانەی ئێمە بەچاو دەیبینین‌و هەستی پێ دەکەین ئەوان لە خەونەکانیاندا وەکو دەنگ وەیا بۆن هەستی پێ دەکەن .

کەواتە لەپێش خەونەکەیاندا چۆن هەستیان پێ‌کردووە هەر بەهەمان شێوە هەستی پی‌دەکەنەوە ، وە هەرگیز ناتوانن هەستی پێ‌بکەن وەکو خۆی لەراستی‌دا چۆنە .

رەنگە ئەم رایەی (باڤلۆڤ) کە هیچ پەیوەندی‌یەکی نەهێشت لە نێوان خەونەکاناو داهاتووە سەیر بێت بەلای زۆر کەسەوە چونکە وا دادەنێن کە زۆر جاری وا بووە خەون هاتۆتە دی‌و دوای چەند رۆژێك خەونەکە رووی‌داوە ئەمەش بەلای زۆر کەسەوە ئەوە دەگەیەنێت کە خەون پێزانی دەکات‌و غەیبمان بۆ ئاشکرا دەکات .

بەلام ئەگەر بێت‌و بە چاوێکی زۆر مەوزوعی‌یەوە سەیری رووداوی هەر خەونێك بکەین‌و هەموو رووداوەکانی پێش خەونەکە لێك بدەینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو خەونە ئەگەر هاتوو بە شێوەیەکی ئەوتۆش هاتەدی ئەوا بەمانای ئەوە نایەت کە ئەو خەونە پێزانی لەو رووداوە کردووە ، بەلکو ئەو کەسە بەشێوەیەکی ئەو تۆش بێت لەپێش خەونەکەی‌دا بیری لەو رووداوە کردۆتەوە .

ئێمە دەزانین کە بە لێك‌دانەوەی باری مەوزوعی بە شێوەیەکی زۆر تەواوو زانستیانە زۆر جاری وا بووە کارەساتێك دەست‌نیشان دەکەین کە هێشتا رووی نەداوە .

کەواتە پێزانی بە پەیرەوکردنی هۆیەکان‌و دەست‌نیشان‌کردنی ئەنجامەکانی کارێکی رەواو زانستیانەیە ، بۆ نموونە چەندین جار وتومانە ئەگەر ئەم کارە وا بروات ئەوا لە دوارۆژدا ئەمە ئەنجامەکەیەتی ، وەتا رادەیەك توانیومانە دەست نیشانی ئەنجامەکەشی بکەین ، رەنگە ئەو شتانەش رووی‌دابێت کە بیرمان لی‌کردۆتەوە لێرەدا ئێمە غەیبمان نەزانیوە بەلکو تەنیا مەوزوعی بیرمان لە داهاتوو کردۆتەوەو لێکمان‌داوەتەوە .

هەمان شتیش لە ئیشی رۆژانەماندا زۆرجار بیرێکی سەرپێی لە شتێك دەکەینەوە کە هێشتا رووی‌نەداوە . کەواتە دوورنی‌یە ئەو بیرکردنەوەیە ببێتە هۆی ناوەرۆکی خەونێکمان ئەگەر هات‌و کارەساتی خەونەکەش روویدات ئەوا تەنیا رەنگ‌دانەوەی بیرکردنەوەی پێشوومان بووە .

بۆ نموونە کە دەچین بۆ سەردانی نەخۆشێك لەو کاتەدا چەندین بیری سەرپێی بەمێشکماندا تێ‌دەپەرێت رەنگە نەخۆشی‌یەکەی وامان لێ بکات بلێین بەخوا رەنگە بمرێت وە دوور نی‌یە ئەو بیرکردنەوە سەرپێی‌یە ببێتە خەونێك‌و خەونەکە وا راڤە بکەین کە ئەو نەخۆشە دەمرێت ، لەگەل ئەوەشدا چاك دەبێتەوە ، وەیا ئەگەر مردیش ئایە مردنەکەی کارەساتێکی چاوەروان‌کراو نەبووە !

یان جاری وا هەیە لەسەر شۆستەیەك دەرۆین‌و لەناکاو گوێمان لە دەنگی هۆرنی ئۆتۆمبیلێك دەبێت ، رەنگە لەو کاتەدا هەست بە مەترسی‌یەك بکەین‌و بیری جۆراوجۆری سەرپێی بە مێشکماندا تێ‌پەرێت ، دوور نی‌یە ئەو بیرە سەرپێی‌یانە ببێتە ناوەرۆکی خەونێك ، کەواتە خەون لە هەموو بارێکدا رەنگ‌دانەوەی بیرکردنەوە وەیا رووداوێکی رابردووەو ناتوانین بیبەستینەوە بە رووداوەکانی داهاتووە کە دوا رۆژ بەسەرماندا دێت .

بێ‌گومان راڤەکردنی خەون بەم شێوە ئایدیالی‌یەی لەنێوانماندا تەشەنەی کردووە زیانێکی زۆرمان پێ‌دەگەیەنێت چونکە زورجار خەلکی کە خەون دەبینن‌و دەیگێرنەوە بۆ یەکتری ئەو کەسەی راڤەی دەکات زورجار کارەساتی ناخۆش لە خەونەکە دروست دەکات‌و وای بۆ دەردەبرێت کە ئەو کارەساتە ناخۆشانەی توش دەبێت چۆنکە خەونەکەی ئیشارەتی ئەو کارەساتانەی تێدایە ئەمەش دەبێتە هۆی نەسرەوتی‌و مەترسی خاوەن خەونەکەو بیرکردنەوە لەو کارەساتە ناخۆشەی بەسەریا دێت ، وە دوور نی‌یە ئەو نەسرەوتی‌یەی تووشی نەخۆشی بکات ، هەروەکو چەندەها جار رووی‌داوە ، لەو کاتەی ئەو خەونە هەر وەکو ووتمان تەنیا رەنگدانەوەی رووداوی رابردوو هیچ پەیوەندیەکی بە داهاتووە نی‌یە .

---

**سەرچاوەکان** :


١ – نوری جعفر . طبيعة الانسان في ضوء فسلجة بافلوف . ج ، ٢ . بغداد ، مطبعة الزهراء/١٩٧٧ .

٢ – فرويد ، سيجوند . تفسير الاحلام . ط ٢ . القاهرة ، دار المعارف ، ١٩٦٩ .

٣ – فرويد ، سيجموند . الحلم وتأويله . ترجمة جورج طرابيشي

٤ – يوسف شاروني . اللامعقول في الادب المعاصر . القاهرة ، دارالكاتب العربي ، ١٩٦٩ .

٥ – برجسون ، هنري . الطاقة الروحية . ترجمه سامي الدروبي القاهرة ، ١٩٧١ .

# سەرژمێری گشتی دانیشتوان و دەوری لە گەشەپێداندا

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە (سەرژماردنی دانیشتووان) و دەوری سەرژمێری لە نەخشەکانی گەشەپێداندا بەگشتی دەکۆڵێتەوە وبریتیە لەم خالأنەی خوارەوە :

١ – پێشەکیەکی مێژوویانە.
٢ – تایبەتێتیەکانی سەرژماردنو جۆرەکانی.
٣ – چەند سەرنجو رەخنەیەك لە سەرژماردن.
٤ – ئامانجەکانی سەرژماردنو پەیوەندیی بە نەخشەکانی گەشەپێدانەوە.

**● پێشەکیەکی مێژوویانە ●**

بیرکردنەوە لە سەرژماردنی خەڵکی شتێکی کۆنەو، مرۆڤ لە چاخە هەرە کۆنەکانەوە زانیویەتی. ئەو نووسراوە بزماریانەی کە لەلامان هەن پیشانی دەدەن کە سەرژمێرێکی نیمچە تەواو بە درێژایی



**ئەو قۆناغە شارستانییە جۆراوجۆرانە هەبووە کە مێژووی کۆنی عیراق پێدا تێپەڕیوە. بەڵام ئەم سەرژمێرانە تەنیا چەند لایەنێکی تەسکیان دەگرتەوە. وەکو پیشاندانی ژمارەی ئەو کاهینانەی کە لە پەرستگاکاندا کاریاندەکرد، یان ژمارەی ئەو کۆیلانەی کە لە کێڵانی ئەو زەوی‌و زارانەوا بەکاردەهێنران کە لەژێر دەستەڵاتی پەرستگاکانا بوون‌و هەروەها ژمارەی مەڕو ماڵات‌و دانەوێڵەی ئەو پەرستگایانە. ئەم سەرژمێرە تەسکانە ماوەیان بۆ زانینی سەرژمێری بەشێوەیەکی گشتی خۆش دەکرد.**

چەند پەنجە درێژکردنێك هەن دووپاتی دەکەنەوە کە سۆمەرییەکان شتێکیان دەربارەی ژمارەی دانیشتوان لەو ناوچانەدا دەزانی کە حوکمیان دەکرد، لەوانەش ئەو پەنجە بۆ کێشانەی کە لە یەکێك لە نووسینەکانی میر (گۆدیا) دا هاتووە، کە لە ساڵانی ٢١٤٤-٢١٢٤ پ.ز.دا (لەگەش)ی (تەلۆی ئیستا) ی حوکم کردووە، کە دەڵێت(نینکرسۆ)ی خواوەند لە نێوان (٢١٦) هەزار پیاودا بۆ ئەوە هەڵیبژاردووە تا کحوکمرانێکی دڵسۆزی لەگەش بێت[١]. ئینجا ئەگەر وای دابنێین ئەم ژمارەیە تەنیا ژمارەی نێرینەکانە، چونکە لەنێوان پیاواندا هەڵبژێردراوە، ئەوە وادەگەیەنێ ژمارەی دانیشتوانی لەگەش لەو کاتەدا لە (٤٥٠ر٠٠٠) کەس زیاتر بووە.

لەوڵاتی بابلیش‌دا لە سێیەم هەزاری پێش زایین‌دا ژمێرکارییەکی سەروبەری زەوی‌و زارو خانووبەرە کراوە، واتە ژمێرکارییەکی خانووبەرەو ژمێرکارییەکی کشتوکاڵ بە مەبەستی زانینی دارایی کراوە. ژمێرکاری هەروەها لە چین‌و میسرو وڵاتی کۆنی فارسیش‌دا کراوە[٢]، چونکە تۆمارە چینییەکان کە لە ساڵی ٢٢٧٥ پ.ز. ئەوە دەستپێدەکەن پیشانی دەدەن کە ژمارەی باج دەرەکان بەشێوەیەکی رێك. لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی تر تۆمارکراوەو. ئەم تۆمارکردنە تا ساڵی ١٧١٢ ز. کە سەرژماردنی خەڵکی بەشێوەیەکی رێکوپێك کراوە هەر بەردەوام بووە. کۆنترین سەرژماردنیش لە چیندا، وەکو هەندێك لە شارەزایان دەڵێن، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٣٠٠٠ پ.ز[٣].

تەوراتیش باسی دوو سەرژمێری سەربازی دەکات، یەکەمیان لەکاتی کۆچ کردنی ئیسرائیلییەکان‌و شارنیشینەکان‌دا لە خێڵگای لاوییەکانەوە (لە نزیکەی ١٥٠٠ پ.ز.دا). دووەم سەرژمێریش «یۆئاب» بە فەرمانی داود پێغەمبەر کردوویەتی[٤].

تۆمارە میسرییەکانیش هەروەها دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمە کۆنەکان‌و، پاشان پەرەیان سەندووەو لە سەدەی چواردەی پێش زایین‌دا بوونە بە تۆماری تەواو، کە لە تۆمارەکانی وڵاتی فارس دۆڵی نیل دەچن. لە سەردەمی فیرعەون«ئەماسس» (٥٧٠-٥٢٦ پ.ز.) دا هەروەکو هیرۆدۆت دەڵێت. سۆلۆنیش دەوری هەرە چاکی هەبووە لە گواستنەوەی رێبازی تۆمارکردنی میسرییانە بۆ ئەتینا. ئەم رێبازە پەرەی‌سەندووە تا بووە بە تۆماری رێکوپێك بۆ هاووڵاتییە ئەگریکییەکان، وەك لە نەخشی سەر بەردەکاندا دۆزراونەتەوە. بەڵام یەکەم سەرژمێر لە ئەتینادا ئەو سەرژمێرەیە کە لە سەردەمی دیمترۆس لە ساڵی ٣١٧ پ.ز.دا کرا[٥].

ئەو سەرژمێرەی کە رۆمانەکان لە سەردەمی سیرفیۆس تۆلیۆس (٥٧٨-٥٣٥ پ.ز.)دا کردیان بە باشترینی ئەو سەرژمێرانە دادەنرێت کە لە سەردەمە کۆنەکاندا کراون. سەرژمێرەکانی رۆمانەکان هەر پێنج ساڵەی جارێك سەرژمێری هاووڵاتییان‌و داراییەکانیانیان دەکرد بۆ دەستنیشانکردنی ئەو قەرزانەی لەسەریانن. لە ساڵی پێنجی پێش زانیشدا ئەم کارە فراوان بووەوە تا گشت ئیمپراتۆریەتی رۆمانیی گرتەوە، بەڵام پاش رووخانی رۆما ئەم کارە نەما[٦].

لە ساڵی ١٤٤٩ یشدا شاری نورەمبەرگی ئەڵەمانی کە هەرەشەی گەمارۆدانی لێدەکرا سەرژماردنێکی تەواوی دانیشتووانی کرا[٧]. لە بەشی رۆژهەڵاتی کەنەدایشدا ساڵی ١٥٦٥ سەرژماردنێکی دانیشتووان کرا[٨].

بەشێوەیەکی گشتیش دەکرێ بوترێت ئەم سەرژمێرە نوێیانە لە ماوەی بەر لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەم نەدەزانرا. بەڵکو ئەوەی دەزانرا ئەوەبوو لیستە بۆ دانیشتووان‌و بۆ باج دەرەکان، یان بۆ ماڵ‌و مڵکە گران بەهاکان بگرنەوە. لە سەرەتا مەبەست لەو لیستانە سەرژماردنی گشت خەڵکی، یان بەشێکی نموونەیی لەوان نەبووە، بەڵکو مەبەست لەوانە بوو کە لە جۆرە تایبەتییەکان بوون وەکو سەرەك فرمانەکان‌و ئەوانەی لە تەمەنی خزمەتی سەربازی‌دا بوون[٩].

سەرژمێری نوێ لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەوە دەستی بە دەرکەوتن کرد. لە ساڵی ١٦٦١ دا جی.بی. ریسکیۆلی یەکەم هەوڵی دا بۆ خەملاندنی دانیشتووانی دنیا[١٠]. لە ساڵی ١٧٠٣ دا یەکەم سەرژمێر لە ئایزلەندەدا کرا[١١]. لە ساڵی ١٧٤٢ یش‌دا دەستکرا بە

سەرژماردنی چەن ولایەتێکی ئەڵمانیو ، چەند ولایەتێکی ئیتالی وەکو تۆسکانی لە ١٧٦٦ داو ، بارما لە ساڵی ١٧٧٠ داو سەردینیا لە ساڵی ١٧٧٣ و ١٧٩٥ دا[١٢] . سویدیشەرژمێری لە ساڵی ١٧٤٩ داو[١٣] . نەرویجیش لە ساڵی ١٧٦٩ داو[١٤] دانیمارکو ئیسپانیا لە ساڵی ١٧٨٧ داو سەقەلییە لە ساڵی ١٧٨٨ داکرد[١٥] لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایش‌دا یەکەم سەرژمێری رێکوپێك لە ساڵی ١٧٩٠ داکراو لە بەریتانیاو فەرەنسایش‌دا یەکەم سەرژمێری تەواو لە ساڵی ١٨٠١ دا کرا[١٦] ، بەڵام کەنەدا یەکەم سەرژمێری تەواو لە ساڵی ١٨٧١ داو هیند لە ساڵی ١٨٧١-٧٢ دا کرد[١٧] .

دوای ئەوەی کۆنگرەی سەرژماروونی نێو دەوڵەتان لە ساڵی ١٨٧٢ دا بناغەکانی سەرژماردنی نوێی دانا[١٨] ، سەرژماردنی لە زوربەی ولاتانی ئەوروپاو هەندێك لە ولاتە ئاسیاییەکانو ئەودوانی ولاتانی دنیادا بلاوبووەوە تاوەکو داگیرسانی دووەم جەنگی جیهانی کە گشت ولاتان بەهۆی دۆخی جەنگەوە لەم کارە کەوتن . پاش تەواوبوونی جەنگ دەوڵەتانی دنیا دەستیان‌کردەوە بە سەرژماردن تاوەکو زیاتر لە (١٥٠) دەوڵەتو رێکخراوەی گرتەوە کە نزیکەی دوو هەزار ملیۆن کەسی لە ماوەی ١٩٤٥-١٩٥٤ دەگرتەوە[١٩] .

ئەو دەوڵەتانەی کە دە ساڵەی جارێك بەشێوەیەکی رێکوپێك لە ماوەی ساڵانی ١٨٥٥-١٩٥٤ سەرژماردنیان دەکرد دەکرێت لەم خانەخانەیەی خوارەوەدا بیانخەینە روو :

| ماوە | ئەفریقیا | ئەمریکای سەروو | ئەمریکای خواروو | ئاسیاو دوورگەکانی ئۆقیانووسی هێمن | ئەوروپا | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٨٥٥-٦٤ | – | ٤ | ٢ | ١ | ١٧ | ٢٤ |
| ١٨٦٥-٧٤ | – | ٢ | ٥ | ٣ | ١٩ | ٣٩ |
| ١٨٧٥-٨٤ | ١ | ٥ | ٤ | ٦ | ٢١ | ٣٧ |
| ١٨٨٥-٩٤ | – | ٦ | ٣ | ٦ | ٢٠ | ٣٥ |
| ١٨٩٥-٩٠٤ | ٢ | ٧ | ٥ | ٧ | ٢٣ | ٤٤ |
| ١٩٠٥-١٤ | ٢ | ٧ | ٤ | ٦ | ٢٣ | ٤٢ |
| ١٩١٥-٢٤ | ٢ | ٩ | ٤ | ١١ | ٢٢ | ٤٨ |
| ١٩٢٥-٣٤ | ٢ | ٨ | ٢ | ١٠ | ٢٧ | ٤٩ |
| ١٩٣٥-٤٤ | ٣ | ٩ | ٦ | ٩ | ١٧ | ٤٤ |
| ١٩٤٥-٥٤ | ٢ | ١٢ | ٨ | ١٥ | ٢٨ | ٦٥ |

## ● تایبەتێتییەکانی سەرژماردنو جۆرەکانی ●

سەرژماردن بەپێی بۆچوونی (جۆن کلارك) ئەو (کۆمەڵە کاروبارە تایبەتەیە بە دەستنیشانکردنو کۆکردنەوەو بلاوکردنەوەی زانیارییە دیمۆگرافییەکان دەربارەی کۆمەڵێك دانیشتوان لەناو چوارچێوەی سنووری ناوچەیەکی تایبەتیداو لە ماوەیەکی دیاردا»[٢٠] . یان بە واتایەکی فراوانتر ئەو گشت کاروبارەی کۆکردنەو بارمتەکردن و نرخاندنو شیکردنەوەو بلاوکردنەوەی زانیارییە دیمۆگرافیو ئابووریو کۆمەلایەتییەیە کە لە هەرێمێك یان بەشێکی هەرێمێکدا دەکرێت[٢١] .

ئەم کارەیش لە رێگای سەرژماردن هەر چەند ساڵەی جارێك بەشێوەیەکی رێك دەکرێت ، وایش بەباش دەزانرێت لەو ساڵانەدا بکرێت کە کۆتاییان بە سفر دێت ، تیایدا گشت کەسێك لە دانیشتوان تۆمار دەکرێن ، هەروەهایش ئەو خەملاندنانەی ژمارەی دانیشتووانیش لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر دەگرێتەوە بەپێ

ئەوەی بەراستی سەرژماردن بکرێت [٢٢] .

سەرژماردنی نوێ چەند تایبەتییەکی هەیە دیارترینیان ئەمانەن :

١ – گشت کەسێکی دانیشتوو یان نیشتەجێ یان هەردوکیان پێکەوە بگرێتەوە (چ هاوولاتیو چ بێگانەیش) لە چوارچێوەی ناوچەیەکی دیارداو بەبێ رەش‌کردنەوە یان دووبارەکردنەوە .

٢ – گشت کەسێك لەساتی سەرژماردنەکەدا یان نزیکترین وەخت لەو ساتەوە بژمێردرێت . هەروەکو پێویستە زانیارییانەی کە ئامادەکراون بەند بن بە ماوەیەکی تەواو زانراوەوە .

٣ – تاکە کەس بناغەی ژماردن بێت نەك ئاقم ، چونکە تەنیا بەم شێوەیە دەکرێت تایبەتێتییە جۆربەجۆرەکانی گشت کە بەشێوەیەکی راست و چەپ بەش بەش بکرێن (وەکو تەمەن ، پیشە ، خوێندەواریو نەخوێندەواریو . . .هتد)

٤ – لە ناوچەیەکی بەوردی دەستنیشانکراودا بکرێتو ، کۆکردنەوەو جیاکردنەوەو بلاوکردنەوەی زانیارییەکان بەپێی ناوچە بەرێوەبەرایەتییەکان بێت .

٥ – لەماوەیەکەوە بۆ ماوەیەك بێت کاتەکانی دیارو نەگۆرابێت بۆئەوەی بە ئاسانی بەراورد بکرێن (وەکو ئەوەی هەر دە ساڵەی جارێك بێت) .

٦ – گشت زانیارییەکانی سەرژماردن خۆیان لە خۆیاندا هیچ کەڵکێکیان نییە ئەگەر بەش‌بەش نەکرێنو بەپێی ناوچە جوگرافییەکانی هەرێمەکە بلاونەکرێنەوە ، بۆئەوەی شارەزایان بتوانن لێیان بکۆڵنەوەو لە کۆری نەخشەکێشانی ئێستاو دوارۆژدا سوودیان لێ ببینن .

٧ – سەرژماردن بۆ دجەیەکی گەورەی دەوێتو ، پێویستیشی بە هاوکاری کردنی وەزارەتەکانو دەزگاو دەستە حکومەتییە جۆربەجۆرەکان هەیە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی باش بکرێت . بەمەیش لەتوانادا نییە سەرژماردن بەبێ سەرپەرشتی حکومەت بکرێت ، چونکە هەر حکومەتی مەرکەزییە بە هاوکاری‌کردنی حکومەتە ناوچەییەکان دەتوانێت ئەم کارە بکات .

بەلام ئەو رێگایانەی کە لە سەرژماردندا پەیرەودەکرێن لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر جیاوازن ، بەلام بەگشتی جۆرە سەرژماردن هەیە [٢٣] :

**١ – سەرژماردنی واقیعی یان بەراستی :**

واتە خەڵکی لە رۆژی سەرژماردنەکەدا لەو شوێنانەدا بژمێردرێن کە لێین بەبێ گوێدانە جێگای دانیشتنی ئاساییان یان بە بێ گوێدانە ئەوەی ئایا لەبەر هەر هۆیەك بێت بەسەرردان هاتوون بۆ ئەو شوێنە یان نا . بۆیە ئەم کارە بە قەدەغەکردنی هاتوچۆ گردکردنەوەی دانیشتووان لە جێگای دانیشتنی خۆیاندا رێ‌خۆش‌دەکرێت بۆ ئەوەی سەرژماردنەکە بە ئاسانی بکرێت ، هەروەکو ئەمە لە بەریتانیاو عیراق‌و میسردا وەهایە .

کار هەرچی چونێك بێت ئەم رێگایە دابەش‌بوونی دانیشتووان بەراستی پیشان نادات‌و ، دەشێ لەناو تۆمارکراوەکاندا کەسی وەها هەبێت هەر بەرێکەوت‌و یەکەمجاریشی بێت هاتووبێت بۆ ئەوێ‌و ئیتر هەرگیز بەوێدا نەچێتەوە ، بەهەرحاڵ ئەم رێگایە لەوی تر ئاسانترە بۆ تۆمارکردنی خەڵکی لەو شوێنەدا کە هەن بەبێ ئەوەی تووشی‌بوونی گیروگرفتی دانیشتنی هەمیشەیی‌و کاتی‌و ،کەمتریش دەبێتە هۆی تووش‌بوونی هەڵە لە ولاتە تازە پێگەیشتووەکاندا .

**٢ – سەرژماردنی تیۆری :**

واتە ژماردنی کەسان بەوەی بگەرێنەوە بۆ جێگای دانیشتنی هەمیشەییان نەك لەو جێگایەی کە شەوی سەرژماردنەکە لێین ، هەروەکو لە ولاتە یەکگرتووەکانو کەنەدا وایە . خۆ ئەگەر بەرێکەوت یەکێك لە خێزانەکە لەوێ نەبوو ئەوە لەگەڵ ئەوەیشدا هەر لەگەڵ خێزانەکەیدا لەو شوێنەی بە هەمیشە لێ دادەنیشن تۆمار دەکرێت . هەروەکو لەم رێگایەی سەرژماردنەیشدا دەردەکەوێت وێنەیەکی راستی دانیشتووانو جێگای دانیشتنیانو وێنەی گشت شتێك وەکو هەیە دەخاتە روو . بەلام لە جۆرەکەی پێشوو زەحمەتترە لەبەر زەحمەتی زانینی جێگای هەمیشەیی دانیشتن‌و ئەو ئالۆزییانەی لە تۆمارکردن‌دا بەدوایدا دێت یان لەبەر زەحمەتی دەستنیشانکردنی ئەو جێگایانە .

## ● چەند سەرنج‌و رەخنەیەك ●

ئەو سەرژمێرانەی لە جیهاندا هەن گشت دانیشتووانی ئەم جیهانەیان نەگرتووەتەوە بەڵکو تەنها : یەکەی سێ لەسەر چواری دانیشتووانیان گرتووەتەوە ، ئەو دوایەکەشی بە مەزندە دانراون ، ئەو مەزەندانەیش جاری وا هەیە بە دەیان ملیۆن کەس زیاد یان کەم دادەنێن . ئەنجامی سەرژمێرەکانیش ئەوەندە وردو راست نین وەکو بیریان لێدەکەنەوە ، لەگەڵ نزیکیشیان‌دا لە واقیعەوە گشت راستییەکە پیشان نادەن . ئەوەیش لەبەر چەند هۆیەکە ، گرنگترینیان [٢٤] .

أ – جیاوازی کاتی کردنی ئەم سەرژمێرانە لەنێوان دەوڵەتانی جیهانیدا چونکە هەر دەوڵەتەو رۆژێکی تایبەتی دەستنیشان دەکاتو بەپێی خولێکی

تایبەتی ئەم کارە دەکاتەوە ، ئەمەیش دەبێت بەهۆی ئەوەی ژمارەی دانیشتووانی چەند هەرێمێك لە مانگێك یان تا لە ساڵێکیش‌دا نەزانرێت .

سەرەرای ئەوەیش ماوەی نێوان سەرژماردنەکان وەکو یەك نین ، هەندێك ولات بەرێکوپێکی لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی تر دەیکەنەوە ، وەکو هەر پێنج ساڵەی جارێك (فەرەنسا ، ژاپۆن) و هەندێکی تر هەر دە ساڵەی جارێك (ولاتە یەکگرتووەکان ، بەریتانیا) ، لە هەندێك حالەتیش‌دا ماوەی سەرژماردنەکان رێك نین‌و ، وە یان بیست ساڵ جارێك دەکرێن وەکو لە بەرازیل یان پانزە ساڵ جارێك وەکو لە ڤەنزەوێلادا[٢٥]

ب – جیاوازی ئەو رێگایانەی لە سەرژماردن‌دا دەگیردرێنە بەر هەروەکو لەمەو بەریش پەنجەی بۆ درێژکرا ، کە ئەوەیش دەبێت بە هۆی بەزەحمەتی بەراورد کردنی نێو دەوڵەتانە ، چونکە هەر رێگایەو ئەنجامی تایبەتی هەیە . لە کاتێك‌دا کە فەرەنسایەکان لەیەك شەودا ئیستمارەی سەرژماردنەکانیان پردەکەنەوەو پاشان کۆدەکرێنەوە ، لە ولاتە یەکگرتووەکان‌دا دەبینین سەرژمێرەکان دەچنە مالان ، کە ئەمەیش دەشێت چەند هەفتەیەکی پێ‌بچێت . لە هەندێك لە ولاتەکانی ئەمریکای لاتین‌دا پێویستە دانیشتووان بچنە ئەو دایەرە تایبەتانەی سەرژماردن‌و خۆیان تۆماربکەن[٢٦] .

ئاشکرایشە گوێنەدان‌و حەزکردن بە دانی زانیاری هەڵە لەبەر هەر هۆیەك بێت دەشێت ببێت بە هۆی هەڵەکردن لە سەرژماردنەکان‌دا .

ج – سەرژماردنەکان لە چەندێتی‌و نرخی ئەو زانیاریانەی مەبەستیانە یەك تا ئەوی تر جیاوازیان هەیە . ئەو دەوڵەتانەی دەمێکە سەرژماردن دەکەن زیاتر بایەخ بە گشت لایەنە وردەکان دەدەن‌و وردتریشن لە دەستنیشانکردنی پیشەو تەمەن‌و لایەنە ئابووری‌و کۆمەلایەتییەکانی کەسان . کەچی ولاتە تازە سەرژمێرکەرەکان رێگای تۆمارکردنی لایەنە سەرکییەکان دەدەن کە زۆر جار بەزەحمەت دەزانرێت چییە . هەروەکو دەکرێت پێودانگی جیاجیا بۆ لێك جوداکردنەوەی لادێ نیشینەکان‌و شار نشینەکان بەکار بهێنرێت ، یان بەکارهێنانی پێودانگە بەرێوەبەرییەکان‌و ژمارەی کەسان‌و پێودانگە ئابوورییەکان وەکو بناغە بۆ لێك جیاکردنەوە . ئەوەی زیاتریش سەر تێك دەدات ئەوەیە هەندێك ولات جۆری وەرگرتنی زانیارییەکانی ناوبەناو دەگۆرێت[٢٧] .

ئەم جیاوازییانە لە چەندێتی‌و جۆردا وادەکات وێنەیەکی راستەقینەی دابەش‌بوونی دانیشتووان‌و چریان‌و جۆرەکانیان لە یەك کات‌دا نەزانرێت .

د – لە سەرچاوەکانی تری هەڵەیش لە سەرژماردن‌دا ئەوەیە ئەنجامی ئەو سەرژماردنانە بە ماوەیەکی درێژ دوای کردنیان بلاوەکرێنەوە ، ئەوەیش لەبەر زەحمەتی جیاجیا کردنەوەو وردی‌و زۆری ئەو پارەیەی تێ‌دەچێت . جگە لەوەی یەك جۆرە پێودانگ لە بلاوکردنەوەی ئەو زانیارییانەدا بەکار ناهێنرێت کە سەرژماردنەکان وەدەستیان دەهێنن .

سەرەرای ئەمانەیش زۆر جار رووداوە سیاسییە ناوخۆیی‌و جیهانییەکان دەبنە هۆی تێکدانی وەختی سەرژماردنەکان . هەندێك جاریش سەرژماردنەکانی دانیشتووان بۆ گەشت کەسان بەیەك جۆر ناکرێن ، وەکو ئەوەی لە خوارووی ئەفریقادا سەرژماردنی ئەورووپاییەکان هەر پێنج ساڵەی جارێك‌و ، هی ئەفریقاییەکان هەر دە ساڵەی جارێك دەکرێت .

## ● ئامانجەکانی سەرژماردن‌و پەیوەندیی بە نەخشەکانی گەشەپێدانەوە ●

سەرژماردن یەکێك لەو دیاردە شارستانییە سەرەکییانەی کە ئەمرۆ نەتەوەکان لە نەخشەکێشانی ئەو بناغانەدا بەکاریان‌دەهێنن کە رێکخستنی ئەمرۆو دوارۆژی خۆیان دەیانگرنەبەر ، وەکو سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ زووربەی ئەو زانیارییانەی کە دەوڵەت لە کاری نەخشەکێشانی‌دا پێویستی دەبێت . چونکە بەبێ نەخشەکێشان ئابووری نیشتمانی بنیات نانرێت‌و بەشێوەیەکی تەباو بەرەو ژوورو یەك تەواوکەری ئەوی تر پەرەی پێ نادرێت . بەبێ نەخشەکێشانیش زەحمەتە بەدەنگ پێویستییە ژیانی‌و رۆشنبیرییەکانی هاوولاتیانەوە بچن ، بەتایبەتیش لە ولاتە تازە پێگەیشتووەکان‌دا کە دەزگا بەرهەم هێنەرەکانیان لاوازن . هیچ نەخشەیەکی گەشەپێدانیش بەبێ دەستەبەرکردنی زانیاری وردو گشت لای دەربارەی واقیعی ئەو کۆمەڵەی کە دەویسترێت ئەو گەشەپێدانەی تیا بکرێت سەرناگرێت ، بەتایبەتیش ئەوانەی دەربارەی قەوارەو دابەشبوون‌و جۆری دروستبوونی دانیشتووانن .

لەبەر بایەخی سەرژماردنی دانیشتووان لە لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیان‌دا ، دەبینین زۆر لە لێکۆڵەرەوەکان‌و لە جۆرەها پسپۆرایەتی‌دا هەر یەکەو لە گۆشەی پسپۆرایەتییەکەش خۆیەوە بایەخ بەو سەرژماردن‌و بە ئەنجامەکانیان دەدەن . پسپۆرەکان جوگرافیای دانیشتووان وەکو ئەوانی تر بایەخی تایبەتی خۆیان بە

ئەنجامەکانی سەرژماردنو شیکردنەوەیان هەیە لە ناوچە جیاجیاکانی دەوڵەتو هەڵهێنجانی ئەو پێودانگانەی کە پێویستیان پێ هەیەو خەملاندنی ئەو ئەنجامانەی کە بەندن پێیانەوەو . بۆ روانینە دوارۆژو شوێن پێ هەڵگرتنی ئەو دیاردانەی دەبنە هۆی گۆڕینی نەخشەی دانیشتووان بەو پێیە چ لە رووی کاتەوەو چ لە رووی جێگاوە ، ئەوەیش بۆ ئەوەی پەردە لەسەر ئەو کارکردنە سەرییەکانەی لەرووی ئابووریو کۆمەلایەتیو سیاسیدا لەناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا روودەدەن هەڵماڵرێت .

ئەگەر بویستریتیش لێکۆڵینەوەی زانیارییەکانی سەرژماردن ئەنجامی چاکیان هەبێت پێویستە تاقیکردنەوەکانی زانیارییە سەرژمێرییەکان بەدەربهێنرێن بۆ زانینی وردیو ناوردییانو پێویستیشە بەپێی توانا ئەو زانیارییانە راستبکرێنەوە . پەیوەندییەکی بەتینیش لەنێوان شیکردنەوەی ئەنجامەکانی سەرژماردنو هەڵسەنگاندنی وردی ئەو زانیارییانەدا هەیەو ، لەزۆر کاتیشدا ناتوانرێت ئەو دوو کارە لێك جودابکرێنەوە . هەروەکو پێویستیشە بەرنامەکانی لێکۆڵینەوە شیکردنەوەییەکان لەگەڵ بەرنامەکانی هەڵسەنگاندندا بگونجێنرێنو چونکە نەگونجاوییان دەبێت بەهۆی زیادە ئەرکو رەنگیشە ببێت بەهۆی دابەزینی رادەی کارگوزارییەکانی هەڵسەنگاندنو شیکردنەوەیش پێکەوە (٢٨) .

ئامانجەکانی سەرژماردنی دانیشتووانو بەکارهێنانەکانی دوای پەرەسەندنی پێویستییەکانی خەڵکی لەگەڵ پەرەسەندنی شارستانیو رۆشنبیریدا بەدرێژایی رۆژگار گۆڕاونو جۆربەجۆر بوونە ، بەتایبەتیش لەگەڵ ئەو پێشکەوتنەدا کە لەو ئامرازە خۆکارانەدا بەرپابووە کە بۆ جیاجیا کردنەوەی ئەو زانیارییانە بەکاردەهێنرێن کە تایبەتن بە کەسانەوە . پاش ئەوەی مەبەستی سەرەکی لە زۆربەی سەرژماردنە کۆنەکان زانینی ژمارەی دانیشتووانی دەوڵەت بوو لەکاتێکی دیاردا بۆ ئەوەی لە پێکهێنانی سوپاو باج وەرگرتندا سوودیان لێ ببینرێت ، ئیستا وای لێهاتووە بە ئامانجی ئەوە بێت (سەرچاوە بەشەرییەکان بەتەواوی دەستنیشان بکرێن بۆئەوەی لێکۆڵەرەوان بتوانن رەنگدانەوەی هۆیە جۆربەجۆرەکان لەسەر زیادبوونی دانیشتووانو پەرەسەندنیان بزانن و پێشبینی بۆ ئەو پەرەسەندنانە بکەن کە لە دوارۆژدا لەسای دۆخێکی دیاردا بەسەر ئەو هێزە بەشەرییەدا دێن» (٢٩) .

سەرژماردن هەروەها بۆ زانینی ژمارەی دانیشتووە جێگیرەکانی دەوڵەت یان بۆ زانینی ئەو دانیشتووانەن کە هەن یان بۆ زانینی هەردوو جۆرەکە پێکەوەو ، دابەشکردنیان بەپێی ناوچە جوگرافییەکانی دەوڵەت بە لادێو شارەوەو ، جۆری دروستبوونیانو تەمەنیان ، سەرەرای زانینی باری ماڵو ژنداریو تەندروستیو ئایینیو زانیاریی دانیشتووان ، بێجگە لە دابەشبوونیان بەپێی پیشەو کارو پیشەسازییە جۆربەجۆرەکان .

بەمەیش وای لێهاتووە سەرژماردنەکانی دانیشتووان بە مەبەستی دەستەبەر کردنی زانیاریی سەرژمێرییە وردەکان بن دەربارەی واقیعی کۆمەڵو جیاجیاکردنەوەی ئەو زانیارییانەو شیکردنەوەیان بۆ ئەوەی خزمەتی تەکنیکی نەخشەکێشانو زیادکردنی توانای پێ بکرێت ، کە ئەمەیش وا لە دەوڵەت دەکات بتوانێت بناغە راستەکانی سیاسەتی ئابووریو تەندروستیو پەروەردەو کۆمەڵایەتیو ئاوەدانکردن دابنێتو ، نەخشەکانی گەشەپێدان بۆ بەرزکردنەوەی رادەی هاووڵاتیان بکێشێتو ، وامان لێکات رادەی پێشکەوتنی نەتەوەو خۆشگوزەرانی خەڵکەکەی بزانین چونکە ئەوە وێنەیەکی روونی بارودۆخی دانیشتووان لەو گشت لایەنانەوە لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی تر پیشان دەدات ، هەر لە رێگای ئەو وێنەیەیشەوە کاری رژێم لە خێرا پێشخستنی نەتەوەو هەڵسانەوەیدا دەزانینو ، دەتوانین بزانین ئەو نەریتە باوانە چەند لەگەڵ گیانی چەرخدا دەگونجێنو ، بەوەیش دەتوانین رێگای راستی گۆڕین بدۆزینەوەو ، لایە بێهێزەکانی قەوارەی کۆمەڵایەتی بزانینو چارەسەر بکەین . بۆیە زنجیرەیەك سەرژماردن وامان لێدەکات رابوردوو هەڵبسەنگێنینو ئیستایش شیبکەینەوەو دوارۆژیش بخەملێنین .

**سەرچاوەو پەراوێزەکان :**

١ – بروانە دەقە بنەرەتییە بزمارییەکانی «گۆدیا»ی حوکمڕانی لەگەش .

2 – K.D.,Census Encyclopaedia Britannica, (1966) , Vol.5,P.168.

3 – A.Ross Eckler Census, 'Encyclopedia Americana,Vol.6,(New Yourk 1976) , P. 168.

4 – Eney. Brit. op.Cit Vol 5, P. 198& Ency. Amer. op. Cit, Vol 6,P.168.

5 – Ency. Amer., Op.Cit.Vol,6,P.168.

6 – Ibid., Vol.6 P. 168 & Ency. Brit., OP. Cit. Vol. 5. P. 168.

7 – Walter P.Willcox, 'Consus,'

Encyclopaedia of the social siences Vol.3. (New Yourk, 1963). P.295 & Ency. Brit. Op. Cit., Vol.5, P. 168.

٨ - عبد الفتاح محمد وهیب ، له جوگرافیای دانیشتووان ، (دەزگای النهضة العربیة بۆ چاپ و بلاوکردنەوە ، بەیرووت ، ١٩٧٢) ل ١١.

9- The New Ency. Micropaedia, —1974) Vol. 2, P. 679.

10- Ency. of the social sciences, op. cit, Vol. 3.P.675.

١١ - عبد الفتاح وهیب . هەمان سەرچاوەی پێشوو . لاپەرە ١١ .

12- Ency. Brit,. Vol.5, P. 768.

١٣ - دەنیس هـ . رۆدج ، زانستی دانیشتووان ، وەرگێرانی بۆ عەرەبی د . محمد صبحی عبد الحلیم ، کتێبخانەی میسر ، قاهیرە ١٩٦٣ ، ل ١١

14- Ency. of the social sciences, Vol. 3,P.295.

١٥ - محمد عبد الرحمن الشرنوبی ، جوگرافیای دانیشتوان ، (چاپخانەی هونەرلی نویێ ، قاهیرە ، ١٩٧٢) ل ٣٠ - ٣١ .

دەربارەی دانیمارکیش بروانە ئەنسکلۆپیدیای بەریتانی ، بەرگی (٥) ، ل ١٦٨ .

16- John I. Clarke, Population Ceography, 2nd. edition, (Pergamon Press Oxford, 1972), P.8.

هەروەها دەنیس هـ . رووج ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١١

17- Ency. Crit, Vol 5, P 168.

١٨ - محمد السید غلاب ، لەگەڵ محمد صبحی عبد الحکیم ، دانیشتووان لەرووی دیموگرافی و جوگرافییەوە ، چاپی ٢ (چاپخانەی هونەرلی نویێ ، قاهیرە . ١٩٦٧) ل ٢٣ - ٢٤ .

19- U.N.Statisical office, Hand book of Population Census Methods, Studies in Methods, Series F. No 5 Rev I,Vol. I Newyork 1958 P.3

20- John I,Clark, Op. Cit, P.8.

٢١ - نەتەوە یەکگرتووەکان/نووسینگای سەرژماردن ، چەند بنچینەو راسپاردەیەك بۆ سەرژماردنی گشتی ساڵی ١٩٧٢ ، وەرگێرانی بۆ عەرەبی محمد السعدی الخضری و چەند کەسێکی تر ، (لە مەڵبەندی دیموگرافیی سەرووی ئەفریقیادا لە قاهیرە چاپکراوە ، ١٩٦٧ ، ل ٣ .

Handbook of pop Census Methods, Vol.I (1958) , P. 4

٢٢ - هەمان سەرچاوە ل ٣ - ٤

هەروەها بروانە : دولت احمد صادق ومحمد عبد الرحمن الشرنوبی ، الاسس الدیموغرافیة السكان ، (چاپخانەی هونەرلی نویێ ، قاهیرە ، ١٩٦٩) ، ل ٩ ، هەروەها عبد الحسین زینی ، الاحصاء الدیموغرافی . (چاپخانەی العانی ، بەغدا ، ١٩٦٩) ، ل ١٦ هەروەها عباس فاضل السعدی ، پارێزگای بەغدا - دراسه فی جغرافیة السكان ، (چاپخانەی الازهر ، بەغدا ، ١٩٧٦) ل ١٨ .

٢٣ - Clark, P.8 عبد الحسین زینی ، ل ١٧ ، و وهیبە ، ل ١٢ .

٢٤ - دەربارەی ئەو گیروگرفتانەی دێتە سەر رێی سەرژماردن بروانە :

U.N, Methods of Appraisal of Quality of Easic Pata for pop. Estimates K Mannal 2, pop. Studies No. 23, (Newyourk 1955) P.4

٢٥ - جاکلین ب . گارنیێ . جغرافیة السكان ، وەرگێرانی بۆ عەرەبی د . حسن الخیاط و د . مکی محمد عزیز ، (چاپخانەی العانی ، بەغدا ، ١٩٧٤) ، ل ١٢ - ١٣ .

٢٦ - گارنیێ ، هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٢ .

٢٧ - دەربارەی ئەم بابەتە بروانە : عباس فاضل السعدی ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٩ .

٢٨ - مەڵبەندی دیموگرافی سەرووی ئەفریقیا لە قاهیرە ، البرامج القومیة لتحلیل بیانات تعداد السكان کدلیل فی التخطیط ورسم السیاسة ، وەرگێرانی دولت احمد صادق ، (دەزگاو چاپخانەی الشعب ، قاهیرە ، ١٩٦٧) . ل ٨ - ١٠ .

٢٩ - دولت احمد صادق ، سەرچاوەی پێشوو ، ل١١ .

* مەبەست لە (دانیشتووە جێگرەکان) ئەو کەسانەن لە جێگایەکدا بەیەکجاری نیشتەجێن و بەهۆی کارو خوێندنیانەوە پێوەی بەستراونەتەوە . بەلام (ئەو دانیشتووانەی کە هەن) ئەو کەسانەن کە لەو جێگایەدا لەکاتی سەرژماردنەکەدا لەوێ دەبن جا ئەگەر ئەو جێگایە شوێنی نیشتەجێی هەمیشەیان بێت یان بەسەردان لەبەر هەر هۆیەك بێت لەوێ بوونە . مەبەست لەو دانیشتووانەی کە هەن ئەوانە نین کە لە جێگای ئاسایی خۆیاندان لەکاتی سەرژماردندا ، چونکە پزیشکی ئێشکگرو شەفتی شەوانەی کرێکاران لە کارگەکاندا لە جێگای کارەکانیان تۆمارناکرێن بەڵکو لە ماڵەکانیان تۆماردەکرێن (عبد الحسین زینی ، ل ١٥ - ١٦) .

لە ژمارە (٢٥) ی شوباتی ١٩٧٩ ی گۆڤاری «کۆلیجی ئەدەبیاتەوە وەرگیردراوە

**بەبۆنەی**
**دەست پێ کردنەوەی**
**قوتابخانەکانی میللی بە**
**خوێندن .**

**نوسینی : کەریم شارەزا**

# ڕوناکی ڕێگای ژیان

نوێنەرێتیەک لە یەک پەردەدا

**جێگە** :گوندێکی داوێن چیایە .

**بارام** :جوتیارێکی هەژاری نەخوێندەوارە . خەریکی زەوی کێلانە .
**ئایشێ** :ژنی بارامی جوتیارە . خۆیو دوو منداڵی یاریدەی بارام دەدەن .
**ئازاد** :بەڕێوەبەری قوتابخانە بچکۆلەکەی گوندەکەیە .
**شلێر** :مامۆستایێکی ئافرەتە بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری لەناو ئافرەتەکانی گوندەکە نێردراوە .
**فاتم .شەم . خونچە . مەنیج** : چوار ئافرەتی گوندەکەن . لەرێکانی دەگەڕەێنەوەو هەریەکە جەرەیەکی لەسەر شانە یا کوندەیێکی لەپشتە .

**بارام** : **(لەبەر خۆیەوە بەدەم جووتکردنەوە دەڵێ :)**
من جوتیارم
وا بیست ساڵە
جەرگی ئەم زەویە هەڵدەدڕم
بە گاسنو بە هەوجاڕم!
دابین دەکەم
ژیانی خاوو خێزانم .
**ئازاد** :**(دەگاتە ئاست بارامو دەڵێ)**
ماندوو نەبی خاڵەی جوتیار
**بارام** :دووربی لە بەڵای نابەکار
**ئازاد** :چۆنی لەگەڵ کارو بەرهەم؟
**بارام** :کارم زۆرەو بەرهەمم کەم
ژنیم هەمووی ماندووبوونە
ئەمە حاڵمە لەوەتی هەم
کەچی هەندێ کەس ژیانی
باش گۆڕاوە!
خوا پێی داوە!
چاك دەسووڕێ گوزەرانی
**ئازاد** :ئەوانەی کە خوا پێداون
خوێندەوارن
لە هەموو کاری دنیادا
ئاگادارن
کاروباری کشتوکاڵیان
بە ئامێرو تراکتۆرە .
بۆیە وا بەرهەمیان زۆرە
تۆش لەبەر نەخوێندەواری
گیرۆدەی داوی هەژاری!
**بارام** :خۆزگە منیش
وەك ئەو خودا پێداوانە
خوێندەوار بام
لە کاروباری دنیادا
ئاگادار بام!
بەڵکوو لەم قۆرتی ژیانە
رزگار دەبووم
بەرەو ڕێگەی

کامەرانی‌و شادی دەچووم
**ئازاد**: باش‌بوو راستی تێگەیشتی
نەزانینە مایەی گشتی
ئەم بێ هۆش و ئەم نوستنە
ئەم هەژاری و دواکەوتنە!
ئێستاش مژدە بڕیار درا
چ پیاو چ ژن
دەبێ فێرە خوێندن بن!
**ئایشێ**: **(ژنی بارامی جوتیار)**.

گەر هەموومان
رووبکەینە قوتابخانە
ئەی کاروبارو فرمانمان؟
ئەی ژیان‌و گوزەرانمان؟؟
**ئازاد**: بەرۆژ کارو بەشەو خوێندن
.خامەتان بکەن بەچقڵی
چاوی دوژمن!
**بارام**: مامۆستاکەی دەست پێ‌بکەین؟
کەینێ بێین بۆ قوتابخانە
مامۆستاکەی؟!
**ئازاد**: سبەی! سبەی!
لە گشت لایێکی نیشتمان
دەیکەین بە ئاهەنگ‌و سەیران؟

**«ئازادو بارام‌و ئایشێ‌و منداڵەکان لە شانۆکە دەچنە دەرەوە)**
**شلێر**: (تووشی فاتم‌و شەم‌و خونچەو مەنیج دەبێ کە هەر چواریان لەکانی دەگەڕێنەوەو هەر یەکە جەرەیەك یا کوندە ئاوێکی پێ‌یە.)
ماندوو نەبن خوشکانی زین
کچەکانی
خەج‌و ستی شەم‌و شیرین
مژدەبێ رێگەی ژیانتان
بۆ خۆش کرا
بڕیار درا
نەخوێندەوار، چ پیاو چ ژن
بە زۆر فێرە خوێندن بن
**فاتم**: قوتابخانە هەر بۆ پیاوە
ئێمە فێربوون‌و خۆشیان
بۆ ئەوان خستۆتە لاوە!
**شلێر**: نەخێر رایەکەت هەڵەیە
ژن نیوەی ئەم کۆمەڵەیە
تا فێرە خوێندن نەبێ ژن
بڕوات نەبێ بە پێشکەوتن
**شەم**: گەر بۆ قۆڵ رووتی بێ خوێندن
نامانەوێ
نە زانست‌و نە پێشکەوتن!
**شلێر**: خوێندن سەرچاوەی رەوشتە
(رووناکیی رێگای ژیانە)
پێشکەوتن ئاواتی بەرزی
هەموومانە!!
**خونچە**: گەر بچینە قوتابخانە
ئەی ئەم کۆرپە ساوایانە؟
کێ نان بکا؟ کێ ئاو بێنێ؟
کێ مەشکەمان بۆ بژێنێ؟
**شلێر**: قوتابخانە
تەنها سەر لە ئێوارانە
دوای کاروبارو فرمانە
**مەنیج**: مامۆستاکەی دەست پێ‌بکەین؟
بەو خوێندنە
مامۆستاکەی؟!
**شلێر**: سبەی! سبەی
لە گشت لایێکی نیشتمان
دەیکەین بە ئاهەنگ‌و نیشتمان
دەیکەین بە ئاهەنگ‌و سەیران

**(بەردە دا دەدرێتەوە.)**

# پزیشکی لەناو کوردەواری دا

# شیرینە دیان

عبدالرقيب يوسف

شیرین ژنێکی بەناوبانگ وشارەزایێکی زۆری لەمەڕ پزیشکیی میللی کوردیەوە بووە. خزمەتێکی زۆری لەم بابەتەوە پیشان داوە.. زۆرکەس سوودی لە دەرمانەکانی ئەو وەرگرتووە. شیرین شارەزایێکی تەواوی لە نەخۆشیەکانی زگ پەنەمیاوی و چاوکوێی و شکانو برینکاری هەبووە. دەستێکی باشیشی لە مامانکردندا هەبووە.

شیرین لە دیانەکانی کۆیە بووەو دەوروبەری چل ساڵ ئەبێ کۆچی کردووە. لەکاتی ئەودا، پزیشك زۆر کەم

بووینە . . تەنیا یەك دكتۆر لە كۆیەدا هەبووە ، ئەڵێن خەڵكی شام‌و (حلب) بووەو – (دكتۆر صلاح) یان پێ‌وتووە . عەدە كەچەڵ (عبد الله)یش لای ئەو برینپێچ بووەو خانووی ئەوسای (عبد الباقی)یش (باوكی شەهید مامۆستا حاجی بووە) . . لە كۆڵانی تەكیەی (شێخ عز الله تالەبانی) ، لەلای كۆنە سەرا ، شوێنی نەخۆشخانەكە بوو .

خەڵكی زۆر پێویستیان بە شیرین و گوڵ ڕەعبەی‌و شارەزاكانی تری ئەم بابەتەوە هەبووە . شیرین لە خانووەكەی خۆیدا لە نزیك مەرقەدی (شێخی شێخ موسی) ، هەتا تەمەنی گەیشتبووە (٧٥) ساڵیەوە كەمتەرخەمی لەم پیشەییەی‌دا نەئەكردو قەتیش دریغی خزمەتكردنی نەخۆشانی نەكردووە .

شارەزاییكی تەواوی لە چاوكولیەوە بووە . . بەتایبەتی لەو كاتەدا چاوكولی زۆر بووە . ناوبراو بۆ چارەسەركردنی نەخۆشی چاوكولی ، مایەلوس‌و زەردێنی هێلكەی لەگەل ڕۆن‌و ئارد تێكەڵ دەكرد .

زگ‌پەنەمیاویشی بە بەكارهێنانی هەنگوین‌و تور چارەسەر دەكرد . پەنجەی بە هەنگوین دەكردو زگی نەخۆشی پێ‌دەشێلا . دەستێكی باڵاشی لە گرتنەوەی ئیسقان شكاندا بووە . گەر جار جار سەری لێدەرنەچووبێ ، بۆ لای گوڵی ڕەعبەی ڕەوان ئەكرد ، چونكە گوڵی لەم بارەیەوە زیرەكترو شارەزایی پتری هەبووە .

سەرەرای ئەمانە ، شیرین سنعەتكاریشی كردووە . خەڵكی كۆیە پێیان دەگوت «دەست ڕەنگین» ، چونكە لە كۆیە هەر ئافرەتێ دەستێكی باڵای هەبێ لە سنعەتكاری . . پێ‌ی دەڵێن «دەست ڕەنگین» بەڵی شیرینی دەست ڕەنگین جاجم‌و بەرماڵێ نوێژو (حەوج) ی زۆر جوانی دروست ئەكرد .

شیرین ژنێكی ڕەشتاڵەی زل‌بوو . ناجی خان[1] كە زۆر جار بینیویەتی ، ئەڵێ : (تا ئێستاش لە كۆیە كە ژنان بەشەڕدێن ، گەر یەكێكیان لەوەكەی تر زلتربێ ئەوە پێ‌ی ئەڵێن «شیرینە دیان» .

**دەرمانەكانی شیرین لە (طب)ی كۆندا**

هەندێك لە دەرمانەكانی شیرین لە سەرچاوەكانی (طب) ی ئیسلامی كۆندا هاتووە . شیرین كە زەردێنەی هێلكەو ئاردو ڕۆنی بۆ چاوكولی بەكارهێناوە ، لە كتێبەكانی پزیشكی – یش‌دا ئەمە دووپات دەكرێتەوە .

ابن البیطار (عبد الله بن أحمد الأندلسي ٦٤٦ ك/١٢٤٨ ز) ئەڵێ : «وصفرة البیض المسلوق اذا خلطت بزعفران‌و دهن ورد كان نافعا من الضربات العارضة للعین»[2] رازی (ابو بكر محمد بن زكریا – سەدەی نۆیەمی زایینی) لە (الحاوی ب ٩ ل٤٤) دا ئەڵێ ، كەوا زەردێنەی هێلكە بۆ وەرەماندن دەرمانە . . بەتایبەتی پەنەمەی منداڵدان . الملك المظفر (یوسف بن علی الرسولی ٦٩٤ ك/١٢٩٥ ز) لە كتێبەكەیدا (المعتمد في الأدویة المفردة ل ٤٤) دا دەربارەی سوودی هێلكە قسەی كردووەو ئەڵێ كەوا بۆ پێلوو چاو باشە . .

هەروەها بۆ گوێچكە . توێكلەكەشی ، دوای ووردو خاشكردنی ، بۆ گڕو خورانی چاو چاكە .

داود الأنطاكی (١٠٠٨ ك = ١٥٩٩ – ١٦٠٠ ز) ئەڵێ : تێكەڵاوكردنی زەردێنەی هێلكەو ئاردەجۆ ، دەرمانێكی باشە بۆ چاوكولی . هەروەها بۆ ئەستووربوونی مەمك . – عبد اللە‌ی أشبیلی – یش ، زەردێنەی هێلكە بە دەرمانێكی باشی چاوكولی زانیووە[3] . پزیشكی كورد هەروەها ئەڵێ : «ئاردی – گەنمی بهارە – لەگەل ڕون دەرمانی مژویلانكیێ (پێلوێ) ئەستووربوی‌یە ، ل ٢ لە (طب كوردی) دەستخەتی سراج الدین خلیلی . . ساڵی ١٩٦٣ لەبەردانەیەك كە لە ساڵی ١٢١٢ ك = ١٧٩٧/١٧٩٨ ز) دا نووسراوە ، دەستنووس كراوەتەوە . ئیتر نازانین كەی دانراوە[4] .

**شیرین‌و دەرمانی (هەنگوین‌و تور) :**

لە پزیشكی‌ی كۆندا ، هەنگوین بۆ زۆر نەخۆشی بەكار هێنراوە ، وەكو پەنەمی‌و ئەستووربوون . ابن البیطار ئەڵێ : «یجلو ظلمة البصر ویفید اورام الحلق العضل ویدر البول . . واللثة والاسنان . . والجرامات الفائرة والأورام . .» .

الملك المظفر ئەڵێ : «العسل صالح للأمعاء الوراقه وتهیج الشهوة . . یجفف القروح الفائرة ، یقوي المعدة»[5] .

رازی ، هەنگوینی بۆ «منداڵدان پەنەمیاوی» بە دەرمان زانیوە .[6] .

أنطاكی ئەڵێ ، هەنگوین لەگەل سركەو خوێ ئەستووربوون دەنفێنێتەوە[7] .

دەربارەی تور ، ابن البیطار ئەڵێ : «الفجل یدر البول والطمث . . ومع العسل یقلع القروح الخبیثة والعارض تحت العین واذا شرب مع الخل حلل ورم الطحال بدار الفجل یدفع ضربات المفاصل والنفخة التي في البطن . .)[8] .

ابن هبل (علی بن أحمد بن هبل ٦١٠ ك/١٢١٤ ز)[9] ، توری لەگەڵ هەنگوین بە دەرمانی چاو زانیووە ئەڵێ : «وشرب مائه مع العسل یفید القروح الخبیثة» .

(داود الانطاكی)یش تورو هەنگوین بە دەرمان ئەزانێ . بۆ چەند نەخۆشیەك وەك یاقژكردنەوەی گەدە . هەروەهاش بەرامبەر بە ڕای الملك المظفر[10]

## گوڵیّ رەعبەی
### – پزیشکی برینان –

گوڵیّ رەعبەی ، شاژنە پزیشکێکی چالاكو لێهاتوو و بەناوبانگ بووە . لە شاری کۆیە نیشتەجیّ بووە .

ئافرەتێکی لاوازو چاو بچووكو کز بووە . هاوکاتی شیرین (دیان)ی پزیشك بووەو دەوروبەری ٣٩ – ٤٠ سالیّش ئەبیّ هەردووکیان ، یەك دوای یەك کۆچی دوایان کردووە .

گوڵیّ ، گەلی شارەزاو لێهاتوو بووە . . بەرادەیەك گەر شیرین نەیتوانیایە گەورە برینێك چاك بکاتەوە ، برینداره‌کەی بۆ لای گوڵیّ دەنارد .

رۆژیّ زیاتر لە ١٠ – ١٥ برینداری تیمار دەکرد ، بەتایبەتی شەرە گەرەکی هەر چوار گەرەکەکانی ئەوسای کۆیە لەگردابووەو سەرشکان زۆر بووە . جاری وا بووە ٢٠٠ – ٣٠٠ منالّ ئەکەوتنە ناو یەك و ٢٠ – ٣٠ سەر دەشکا . بێگومان رۆژیّ شەرەگەرەك بوایە ، رێگای مالّی گوڵیّ ۰ ە، ابەوە .

بە سەلیقە بووە .

ئیشی رێكو پێك بر نۆرە بریندارانی تیمار ئەکرد .

ئەگەر کێم لە بریندا هەبووایە ، پاك ئەیشوشتو کێمەکەی فریّدەداو دەرمانی ئەکرد . وە ئەگەر برینەکە توزیّ گەورەو زەخمدار بووایە ئەوە هەموو رۆژیّ فتیلەیەکی ئەخستە ناو برینەکەو رۆژی دوایی دەری ئەهێنا . وە بەم جۆرە تا برینەکە چاك دەبووەو گۆشتەکە یەکی دەگرتەوە .

سوودی فتیلەش ئەوەبووە کە هەموو رۆژیّ کە دەریدەهێنا ، برینەکە پاك دەبووەوە .

**دەرمانەکان :**

١ – چرك :

گوڵیّ رەعبە ، ئەم دەرمانەی لە : بنیشتە تالّو گیابرینە (پەلکی وەکو پەلکی سلق وایە ، دەوری ٣٠ – ٤٠ سم بلّند ئەبیّ)و گیارەکێشە (وەکو گیابرینە وایە) دروست کردووە .

لە کەژی بەهاراندا ، گوڵیّ ئەم گیایانەی لە شاخ و داخی کۆیە کۆ ئەکردەوە .

**٢ – گیابرینە .**

ئەم گیایەی ووشك ئەکرد . . ئەوسا ئەیهێرا تاوەك ئاردی لیّدەهات . ئینجا ئەیخستە سەر برین دوای چەند رۆژێك برینەکە چاك دەبووەوە .

**٣ – گیارەکێشە** : نیۆبراو ، ئەم گیایەی بە دوو جۆر رێگا بەکار ئەهێنا . وەك مەرهەم ، بە تێکەلأوکردن لەگەلّ دوو دەرمانی سەرەوە و بە رێگای ووشککردنەوە . . ئەوسا دەیخستە سەر برینەکە بۆ ئەوەی کێمو ئاوی ناو برینەکە لابباتو برینەکە ووشك ببێتەوە .

٤ – گوڵیّ ، دارەبەنی بە تەری ئەسوتاند . . ئەو ئاوە چەورەی کە لیّی دەهات ، ئەیکردە ناو شوشەیەك . لە پاشان ئێسکی کارمامز یان بەرخ یان هی عەلەشیشی چاك دەسووتاندو ئەیهاریو . . لەگەلّ ئاوە دارەبەنەکەی تێکەلأو دەکرد .

بەم جۆرە شلەیەکی وەك مەرهەمی دروست دەکردو ئەیخستە سەر برین .

گوڵیّ رەعبەی ، چەند جۆرە مەرهەمی تری دروست دەکرد . بەلأم نازانین چینو چۆن دروستی دەکردن .

### دەرمانەکانی گوڵیّو (طب)ی کۆن

هەروەك ووتمان ، گوڵیّ دەرمانی (چرك)ی لە بنێشتیتالّو گیا برینەو گیارەکێشە دروست دەکرد . بەلأم بەداخەوە ، ئێمە ئەم دوو گیایە ناناسین .

وە ئەوەی دەربارەی بنێشتیتالّی دارەبەن (داری قەزوان) و ئاوی قەزوان ، لە (طب)ی ئیسلامیدا ئەبینین ، ئەوەیە کە ئەم بنێشتە تالّە (صمغ الحبة الخضراء والبطم) دەرمانێکی زۆر بەکارەو بۆ زۆر نەخۆشی بەکارهێنراوە . بەتایبەتی بۆ برین وباوەسیرو گورچیلەو میزکردنو بیّ نوێژی وە بۆ سیو (طحال) .

ابن هبل ئەلیّ : ( . . . وعلكه ينفع من شقاق الوجه وبنضج الجراحات الصلبة ويجلو الجرب وصمغه ينقي الجراحات ويبرئ القروح البليغة . . )[11] . داود الانطاكي ئەلیّ : «رمادها يدمل وقشرها يحلل الأورام و(صمغه) ينقي وينبت اللحم . . ومع الزيت يحلل كل ورم)[12]

(المظفر الرسولي وابن البيطار)یش دان بە سوودی بنێشتەتالّ دەنێن .

ئەوەی شایانی باسە ، دەرمان گرتنەوە لە ئاوی هەندیّ درەخت ، زۆر کۆنە لە کوردوستاندا . هەر لە زووەوە کورد ئەمەی زانیوەو ، بە رادەیەك بۆ ولأتانی دەرەوەش رەوانکراوە .

بە (٩٠٠) سالّ لەپێش گوڵیّ رەعبەی ،(ناصری خسرۆ) کە لە سەردەمی دەولّەتی دۆسکیدا هاتە کوردوستان ، لە رۆژی ٢٨ یان ٢٩ی تشرینی دووەمی (١٠٤٦ ز)دا لە نزیك مەرقەد ۰وەیس القەرانی) ، بینیویەتی کەوا کوردەکان داری تەر ئەسووتێنو ئاوەکەیان کۆ دەکەنەوە[13] . قەتران (قطران)یش بە شێوەیێکی ئەوتۆ ئەگرنەوە ، کە نەك تەنیا لەناوخۆ بەکاری دێنن ، بەلّکو بۆ ولأتانی تریشی ئەنێرن .[14] (ناصری خوسرو ) هەرچەند ناوی درەختەکانی نەهێناوە . . بەلأم رەنگە داری

(هەڤرست—ئێرڤست—عرعر)[15] بێت ، کە باشترین درەختە بۆ دەرمانی قەتران . وە لەهەندێ شاخەکانی کوردستان ، بە رادەیەکی زۆر شین ئەبێ .

(قەتران)یش دەرمانێکی زۆر بەکاربووە . گەربێت و تەماشای کتێبەکانی ابن البیطار و أبن هبل وأنطاکی و الرسولی بکەین ، وا بۆمان روون دەبێتەوە کەوا دەرمانێکی زۆر باشەو بۆ چەند نەخۆشیش بەکاردێت لەمانە : ژانە گوێ ، کرم و منالّ نەبوون .[16]

بەلّێ . . گولّێ خانم ، هەروەکو کوردەکانی سەدەی یانزەهەم قەترانی گرتۆتەوەو لە ئاوی درەخت دروستی کردووە . زیاتر لەوەش . ووردە ئاردی ئێسقانیشی زیاد کردووە .

أنطاکی لە باسی (عظام)دا ئەلّێ :

« . . . ورمادها یجفف الترهل والاخلاط الرطبة . . . ویجفف القروح السائلة » . . . «تخدر المفاصل وانواع الضربات . . . وتحبس الدم» ابن هبل ئەلّێ :«ان عظام البقر المحرقة تقطع النزف» .

المظفر الرسولي ئەلّێ : «قوة العظام المحرقة قوة تحلل وتجفف تحليلاً وتجفيفاً بليغاً . . .»[17]

شیاوی باسیشە کەوا (ملا محمود) لە ئێسکی ولاخ دەرمانی دان پێشانی دروست کردووە .

**پەراوێزەکان :**

**١ – دەربارەی شیرینە دیان و گولّێ رەعبەی و نەنەکۆتر ، سوودم لە کاك تۆفیق مەلا صەدیق و خێزانەکەی (ناجی خان) وەرگرتوە . پێشان لە کۆیە دادەنیشتن ، ئێستا لە شاری (رانیە)ن .**

**چەند جار سەری کاك تۆفیق لە شەڕەگەڕەك شکاوە . . گولّێ دەرمانی کردووە .**

**٢ – ابن البیطار : (الجامع المفردات الادویة والاغذیة–موضوع–بیض)**

**٣ – عبدالله بن قاسم ، الحریري الأشبیلي . . (نهایة الأفکار ونزهة الأبصار–چاپی بەغدا ١٩٧٩) .**

**د .حازم البکري و پزیشکی چاو مصطفی شریف العاني لێی‌کۆڵیونەتەوەو بلاّویان کردۆتەوە .دانەر لە سالّی (١٢٢٧ ز)دا شێشکەشی (الملك الأشرف الأیوبی)کردووە .**

**٤ – ئێمە نازانین (ملا محمود)دانەری (طبا کوردی)کێ‌یە . باسی ئەم دەستنووسە کوردیەم لە هیچ سەرچاوەیەکدا نەبیستووە . تا ئێستا زۆر هەولّم داوە کە لە سەرچاوەیێك بیدۆزمەوە ، بەلاّم بێ سوود بووە .**

**هەندێ قسەی سەرپێی هەیە . ئەلّێن کە (ملا محمود) . . (مەلا محمودی بارەشی)یە کە زانایەکی ناوچەی بۆتان بووە .**

**هەندێ (تعلیق)ی ئەو لەسەر دەستنووسەکە هەیە هەلّبەستێکیشی لامە . بەلاّم ناتوانم بلّێم ئەمە راستە یان نا؟**

**٥ – ابن البیطار :«الجامع لمفردات الأدویة والأغذیة–موضوع «عسل»)**

**٦ – ابوبکر الرازي/الحاوي ب ٩ ل ٤٤ .**

**٧ داود الأنطاکي– تذکرة ولی الألباب- موضوع «عسل») .**

**٨ – الجامع لمفردات الأدویة والاغذیة–موضوع «الفجل») .**

**٩ – ابن هبل . پزیشکێکی گەورەو ناوداری سەردەمی خۆی بووە . لە بەغدادا چاوی بە دونیا هەلّهێناوەو کە لێهاتووو ناوی بە پزیشك دەرکردووە ، ناوی بە پزیشك دەرکردووە ، ڕێگای کوردستانی گرتۆتەبەر . چەند سالێ لە شاری خەلاّت لەسەر قەراخی دەریاچەی وان ماوەتەوە . پزیشکی‌ی کردووەو دەرسی پزیشکی‌ی بە منالّەکان گوتووە .**

**ئەوکاتە شاری خەلاّت پایتەختی دەولّەتی شاە ئەرمەن بووە کە سەلجوقیەکان دایانمەزراندبو . پاشی ئەیوبیەکان . کوردەکان دەستیان بەسەرا گرت و هەر بەوناوەوە مایەوە .**

**دوای چەند سالێ ، ابن هبل گەڕایەوە موصل و لەوێ کۆچی دوایی کرد .**

**١٠ – ابن هبل . .«المختارات في الطب– موضوع «بطم») .**

**١١ – داود الأنطاکي« تذکرة أولی الألباب موضوع–بطم» .**

**١٢ – المظفر الرسولي :«المعتمد في الأدویة المفردة – موضوع «بطم») .**

**١٣ – ناصر خسرو– سفرنامە –ل٤٠ یحیی خشاب لە فارسیەوە کردوویە بە عەرەبی .**

**هەروەها تەماشای کتێبەکەمان بکە «حضارة الدولة الدوستکیة في کردستان الوسطی»ل ٢ ب ٣٠١**

**١٤ – ابن جزلەو حسن ابراهیم التفلیسي و داود الأنطاکي ئەلّێن : «عەرعەر سەروی (سرو)چۆل و شاخاویە . بڕوانە «المعتمد»و «تذکرة أولی الألباب» لە باسی «عرعر»دا .**

**أنطاکي لە باسی «شربین» دا ئەلّێ کەوا «عەرعاری بە در' ـە لە شربین» ابن بیطار ـر ـوی شربین و (عەرعەر)ـ ـزە . وە(قطران)ی (عرعر)بە باشترین قەترـ دادەنێت .**

**١٥ – بڕوانە :**

**«المعتمد» و «تذکرة أولی الألباب» لەژێر ناوی «قطران»دا هەروەها باسی «شربین»و «عرعر» .**

**١٦ – لەژێر ناوی «عظام»دا تەماشای کتێبەکانیان بکە :**

**«المختارات . .»**

**«المعتمد . .»**

**«التذکرة . .»**

**١٧ – ملا محمود ، دەستنوسا «طبا کوردی» ل٢»**

- ئەو تووتنەی بۆ جیهانی سێهەم سازدەکرێ زووخاوێکی ترسناکە .
- لە ٩٠٪ ی نەخۆشینەکانی شێرپەنجەی سی‌و لە ٦٥٪ ی شێرپەنجەی دەم‌و پووك لە جگەرە کێشانەوەیە .
- ئەمریکا ساڵانە (٦) ملیار دۆلاری لە بازرگانی تووتن دەست‌دەکەوێت .

# پیلانێکی تەندروستی دژی گەلە هەژارەکان

محمد علی قەرەداغی
وەری گێڕاوە

لە نیوەی دووەمی سەدەی شازدەدا تووتن گەیشتە ئەوروپا ، هەر لەو کاتەیشەوە هەوڵی بەرهەڵستی‌و دانە دواوەی تووتن دراوە . تەنانەت (جاکی یەکەم) ی مەلیکی بەریتانیا ساڵی (١٦٠٠) نووسیویەتی :«جگەرە کێشان گاڵتەکردنە بەو نازو نیعمەتانەی خودا پێی‌داوین ، بۆچی هەناسەی بۆن خۆشی خۆمان بەم دووکەڵە تاڵە پیس بکەین؟»

**هەڕەشەو ترساندن :**

لە ساڵی (١٩٣٠)ەوە وردە وردە بەرگری دینی کپ دەبێتەوە تا ڕێگە چۆڵ بکات‌و دەنگی زانیاری پزیشکی لە باتی ئەو بێتە مەیدانەوە .

ماوەیەکە لێکۆڵینەوەی زانیستیانە زۆر بووەو تێکڕایشیان لەسەر زۆری زیانی تووتن یەکدەنگن‌و دەڵێن لە ٩٠٪ی شێرپەنجەی سی‌و بۆری هەناسەو لە ٦٥٪ی شێرپەنجەی پووك‌و لێو لە تووتن‌و جگەرەکێشانەوەیە . لەمانەیش زیاتر دەڵێن : زیانی جگەرەکێشان کار دەکاتە سەر ژنی سکپڕ دەبێتە هۆی بەرخستن‌و بەراویتەبوون . بەمانەیشەوە ناوەستن‌و ژمارەو سەرژمێر دێتە پێشەوەو دەڵێن : ئەگەر ڕۆژی سێ جگەرە بکێشی لای کەمی سێ ساڵ تەمەنی خۆت کورت دەکەیتەوە ، وە ئەگەر (٢٠) جگەرە بکێشی (٦) ساڵ لە تەمەنت کەم دەبێتەوە .

ئەم بۆچوون‌و لێکۆڵینەوانە وردە وردە دەبنە بڕیارو هەڵوێست‌و هەندێك لە ولاتان مەرجی زۆر لەسەر ئەو کەسانە دادەنێن کە دەیانەوێ پڕو پاگەندە بۆ جگەرە بکەن ، وە هەندێك لەو ولاتانە بە مەرجی ئەگرن لەسەر دەسگای جگەرە دروستکردن کە جگەرەکێش لە زیانی جگەرە ئاگادار بکەن (وەك دەبینین لەسەر پاکەتی جگەرە دەنووسرێت)لە هەندێ لە ولاتانیش‌دا بەرنامەی تایبەتی لە قوتابخانەو زانکۆو دەسگاکاندا هەیە کاری هۆشیارکردنەوەی خەڵکە لە زیانی جگەرەکێشان .لەو ولاتانە : بولغاریاو فنلەنداو ، فەرەنساو یۆنان‌و ئیتالیاو ، یەکیەتی سۆفیەت .

**● قازانجی لە ڕادە بەدەر :**

دەربارەی ڕێگەو جۆری بەربەرەکانی جگەرەکێشان پێویستە چەند تێبینیەك باس‌بکەین : لە هەندێك ولاتاندا ناکۆکیەکی روون لە نێوان سیاسەتی کشت‌وکاڵی‌و هەڵوێستی پڕو پاگەندەی ڕاگەیاندندا هەیە : لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا لە لایەکەوە ولات کشت‌وکاڵ‌و کڕینی تووتن هان‌دەدات لە

لایەکیشەوە هێرشی راگەیاندن دەکرێتە سەر جگەرەکێشانو خووگرتن بە جگەرەوە .

رەنگە ئەمە لەبەر ئەوە بێت ئەو ولاتانە نەیانەوێ لەگەڵ شەریکەکانی جگەرەو دەسگاکانو کشتیارانی تووتندا روو بەروو بن ، رەنگیشە لەبەر ئەوە بێ ولاتە یەکگرتووەکان بیەوێ بەردەوام بێ لەسەر هەموو بازرگانیو کارێك کە قازانجی زۆری بێ ، یان لەبەر ئەمیشو ئەویش .

هەندێك سەرژمێر دەڵێ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لای کەمی سالانە (٦) ملیار دۆلاری لە تووتن دەستدەکەوێت ! زیاد لەم راستیانەیش لەوانەیە بەربەرەکانی جگەرەکێشان هەر نەبێت . ئەگەر هەندێکیش لەم ولاتانە چەند هەنگاوێکیان لەسەر ئەم رێگەیە بەرانبەر بەو حەوت شەریکە گەورەی بازاری جیهانی سێهەمدا بگرن شتێکی ئەوتۆ نیەو بێ بایەخە .

## ● دەرمانخواردکردنی جیهانی سێهەم :

رەنگە لە هەموویشی ترسناکتر ئەوەبێ کە رۆژنامەی (تەندروستی جیهان) کە لە «رێکخراوی تەندروستی ولاتان» دەردەچێ بلاویکردووەتەوەو دەڵێ : ئەو تووتنەی ئامادەدەکرێو دەنێررێ بۆ جیهانی سێهەم دوو قاتو سێ قات تەنانەت چوار قاتیش زوخاووی زیاترە لەو تووتنەی لە ولاتانی رۆژئاوادا دەفرۆشرێت . رەنگە لەبەر ئەمە بێت کە رادەی تووتن کارکردن لە جیهانی سێهەمدا بەتایبەتی لە ئەمەریکای لاتینیو ئەفەریقادا زیاتر دەبێت ، چونکە لە ساڵی ١٩٧٦ دا هەر یەکێك لە جیهانی سێهەمدا ٧٩ر٠ کیلۆ تووتنی کاردەکردو ئەم رادە لە جیهانی پیشەسازیدا لە ساڵێکدا ئەگەیشتە ١٠ر٢ کیلۆ . ئەگەر کوباو ئەرجەنتینو زیمبابوی دەرکەین – کە هەر یەکێکیان بە قەدەر یەکێکی ئەمەریکاو فەرەنسا تووتن کاردەکات– ئەوە رادەی ولاتانی تر بە شێوەیەکی ئاشکرا هاتووەتە خوارەوە : لە تەنزانیا ٤٨ر٠ کیلۆ ، زایر ٣٢ر٠ کیلۆ ،نەیجیریا ١٣ر٠ کیلۆ .

بەلام ئەم سەرژمێرانە کۆنو گەلێ جیاوازییان لەگەڵ ژمارە تازەکاندا هەیە ، چونکە لە کاتێکدا رادەی هۆگربوون بە جگەرەکێشانەوە لە رۆژئاوادا دێتە خوارەوە ئەو رادەیە لە ئەمەریکای خواروو ئەفەریقاو ئاسیادا بەرەرزدەبێتەوە .

## ● سەرژمێرێك :

لە نێوان ساڵانی ١٩٧٤ و ١٩٧٧ دا کارکردنی تووتن لە ئەڵمانیای فیدرالدا بەرادەی ٢ر١ ٪ دابەزیەوەو پلەی هۆگربوون لە بەریتانیادا بە رادەی ٦ر١ ٪ هاتووەتە خوارەوە . بەلام هەر لەو ماوەدا بە رادەی ٦ر٢ ٪ لە بەرازیلداو ، ٩ر٢٩ ٪ لە ئەندەنووسیادا زیادیکردووە . دەبێ ئەوەیش لەبیرنەکەین کە ئەم سەرژمێرە ئەو تووتنانە ناگرێتەوە کە کشتیارانی ناوخۆ خۆیان بەرهەمی دێننو بێ سازکردنی مەکینەو کارگە کاردەکرێت .

## ● زیادەیەکی بەردەوام :

رۆژنامەی (یوبولیشنزر ییورتز)– راپۆرتی گەلان – کە لە زانکۆی جۆن هوبکنز لە ولاتە یەکگرتووەکان دەردەچێ دووپاتی کردووەتەوە کە رادەی تووتن کارکردن لە جیهانی سێهەمدا ساڵانە ٥٪ زیاد دەکات . هەر لەبەر ئەمە بوو سەرۆکی رێکخراوی تەندروستی جیهانی لە بانگەوازە بە ناوبانگەکەی شەشی نیسانیدا کە بەبۆنەی رۆژی بەربەرەکانی جگەرە کێشانەوە لە ولاتە تازە پیاکەوتووە (نامیة) کاندا وتی : (هۆگربوون بە جگەرەوەو بەردەوامی لەسەر جگەرەکێشان دەبێتە گەورەترین زیان بۆ تەندروستی گشتی) .

ئەوەیش جێگەی سەرنجە ولاتە تازە پیاکەوتووەکان زیاتر روودەکەنە کشتوکاڵی تووتن (ساڵی ١٩٧١ لە ٧٥٪ ی ئەو تووتنەی دەکرێت بە جگەرە لە ولاتە تازە پیاکەوتووەکان دەکرا ئەم رادەیە لە ساڵی ١٩٧٧ دا گەیشتە لە ٦٠٪) .

گومان لەوەدا نیە کە بەرژەوەندی شەریکە جگەرە دروستکەرەکان لەوەدایە کە تووتن لەو ولاتانە وەربگرن ، چونکە کرێکار لەوێ هەرزانترەو شەریکەکان پێیان خۆشە تووتنەکەی بە هەرزان لێبکرنو دوایی – هەر تووتنەکەی خۆیانە – بە جگەرەیی بە نرخێکی گران پێیان بفروشنەوە نەك هەر لە سەرەتاوە بە نرخێکی گران لە کشتیاری ئەمەریکی بکرن .

بەلام جیهانی سێهەمێك کە لەژێر باری برسێتیدا دەناڵێنیو لەگەڵ جەنگی ئابووری جۆراو جۆردا رووبەرووە پێویستی زۆری بەو زویو زارەیە بۆ ئەوەی بیانکا بە کشتوکاڵو بۆ خواردەمەنی کەڵکیان لێوەربگرێ .

دوای ئەمانە هەمووی چیرۆکی ئەو تووتنەی کە بە تایبەتی بۆ جیهانی سێهەم ئامادەدەکرێتو بە جگەرەیی بۆیان رەوانەدەکرێت ترسناکترین جۆری ئەو شەرە نهێنییە بۆ گیانی ئەو گەلە هەژارانەو بۆ تەندروستییان .



# بەشێ لە مێژووی وولاتی سولەیمانی

محمد سعید سلیم جاف

دوابەدوای سالّی ۱۲۵۲ ی کۆچی‌و لەناوچونی ئەمارەتەکەی بابان بە دەستی عوسمانیە خوێنخۆرەکان لە ژێر فەرمانڕەوای ئەورەحمان پاشادا ، لاوێکی پێکەوتوو هەڵکەوتوو لە هۆزی هەمەوەندی چەلەبیەکان پەیدا بوو بە ناوی حمە شەریف‌و ناو بانگ بە شەریف ڕەندان ، ئەم شەریف ڕەندانە هەوای فەرمانڕەوای ئەمارەتی بابانی سولەیمانی کەوتە کەللەوە

داوای له عوسمانیەکان کرد سولەیمانی بۆ چۆڵ بکەن . ئەوانیش بەم داواکاریە رازی نەبوونو خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد . شەریف رەندان بە لەشکرێکی دوو هەزار سوارەوە هەڵی کۆتایە سەر سولەیمانی شەڕو کوشتار بە توندی ماوەی چەند حەفتەیەك درێژەی سەند . دوای ماوەیەك شەریف سەرو ریشی زۆر هاتبوو ناردی سەرتاشیکیان هێناو شەریف رووی کردە سەرتاشەکەو پێی‌گوت کاکی سەرتاش سەرو ریشم باش بتاشە چونکە بەیانی ئەم سەرە یا ئەبێ لە کۆشکی شاهیدا پادشا بێت یاخۆ بە نووکی رمەوە دەی‌بینی بۆ رۆژی دوای هەردو لەشکر لە بەینی دەی قرگەو گردی سەیواندا تێکەڵ بوونو شەر گەرمەی تی‌کەوت لاشەی کوردو عوسمانی بە سەریەکدا کەوت . لەوکاتەدا بە ئەمری یەزدان گوللەیەکی وێڵی شەشخان بەر سەری شەریف کەوتو شەریف کوژرا . کاتێ لەشکری شەریف بەسەرهاتەکەیان زانی دەستیان لە شەڕ بەرداو هەڵاتن بە کوژرانی شەریف شەرەکە دوای پێ‌هێنرا .

کوژرانی ئەم لاوە هەڵکەوتوە لە هەموو ولاتی باباندا بوە مایەی دەردو داخو رەشپۆشو سوگەواری بوو لە هەموو دێهاتو کوروو کۆمەڵێکدا شیوەنو چەمەرانەیان بۆ ئەگێرا . (مێژوی ولاتی سولەیمانی ئەمین زەکی بەگ ئەمەش مەڵبەمەی شیوەنو گورانی پیاهەڵدانیەتی کە لە کتێبی فولکلوری کوردی خوا لی‌خوشبوو محەمەد توفیق ووردی وەرم گرتوە .

(١)
شەریف مەردێ بوو لە شا بوو یاخی
ئەسپی دائەکوتا لە دەوری یاخی
تالانی دەنیا لە قەرەداخی

(٢)
شەریف مەردێك بوو مەردی مەیدانی
بە ئەسپی بۆرە دەی کرد جەوانی
تالانی دەینا لە مەریوانی

(٣)
شەریف مەردیك بوو لای (میرەدێیە)
قەڵخانو شمشیر هەردوکی پێیە
شەریف مەکوژن رۆڵەی دایکی‌یە

(٤)
قەڵخانی زەردەو ماینی بۆ دێنێ
هەوری لە سەریەو با ئەی شەکێنێ
شەریفی مەکوژن لاوی گەرمێنێ

(٥)
قەڵخانی زەردەو ماینی شێیە
دەنگی تەپڵی دێ لە میرەدێیە
شەریفی مەکوژان دۆست چاوی لێ‌یە

(٦)
چەندم پێ‌گوتی مەچۆ قەلاتێ
شەشخان بە حوکمە گوللە ئەنگاتێ
جی‌ی کارێت بگری نات‌بێ نەجاتێ

(٧)
یاخوا سەربازان پەنجەتان بشکێ
گوللەیەکیان داوە لە گوی مەمکێ
لە جی‌ی ئەو گوللە زوخاو دەتکێ

(٨)
قەڵخانی زەردەو ماینی باڵەبان
دەنگی تەپڵی دێ لە گردی سەیوان
شەریفی مەکوژن رۆڵەی قارەمان

(٩)
خەبەرێك بدەنە قائمە تیلەکۆ
مەمکێکی نارنج یەکێکی لیمۆ
لە پاشی شەریف کێ‌بیان کا بۆ

(١٠)
دەوری سولەیمانی ئیمرو گیراوە
جارچی جاریان دا شەریف کوژراوە
خەڵکی خەفەت بار دڵ پڕ خوێناوە
بەدەستگاری‌و کورت کردنەوەو نوسیمەوە

نووسینی : ئۆوبەری ئێرلەندی پیتس
وەرگێڕانی : انور عمر محمد

**دیمەنەکە :**

**«چێشتخانەیەك لە خانوویەكدا–ئاگردانەکە ئاگری دەسوتێ ، مێزی نان خواردنێك هەندێ گەلاّ کەلەرمی لەسەرە لەگەڵ دوو سێ سەلك پیازداو ، لەگەنێکیش . . هتد .**

. . . دەرگای چێشتخانەکە نیمچە کراوەیە»

«ڕێبوارێك دەچێتە ژوورەوەو چاوێك بە سەرانسەری چێشتخانەکەدا دەگێڕێ»

**ڕێبوارەکە : ئاخۆ ئەم خانووە چ جۆرە خەڵکێکی تیا دەژی؟**

تۆ بلێی ژەمێکی نان خواردنی تیا دەست کەوێ؟! ئەو مەنجەڵە گەورەیە چی تێدایە؟ ، بزانم . **سەری مەنجەڵەکە هەڵ دەداتەوە) . هیچ . . ئەی ئەم بوتڵە . هەڵی دەگرێو تەماشای دەکا ، ئینجا تامی دەکات)** . ئەمە شیوە . . . ئێ‌ی . . . وادیارە بەخت فریای مرۆڤ ناکەوێ تا لەم شوێنەدا سۆراخی ژیانێکی ئەوتۆ بکا ، تەنانەت پیاوقوتویەکی بچووکیشی دەست ناکەوێ تا مانگاکەی تیا بدۆشێ بزانم ئەم سەنووقە چی تێدایە . (دائەچەمێ بۆ ئەوەی سەرقاپەکەی بەرزکاتەوە) سەیرە کلیل دراوە . . . **(لووتیل کونی کلیلەکەوە نزیك دەکاتەوەو بۆنی دەکا) . . ئاە بۆنێکی خۆشە ، بەلاّم بەچی ئەچێ؟ . . ئێ‌ی . . . با لەسەری دانیشم‌و کەمێ پشوو بدەم . . (خۆی** هەڵدەداتە **سەر سەنووقەکەو لەسەری دادەنیشێ ، نەختێکی پێ دەچێ گوێی لە غەڵبە غەڵب‌و قیقەی مریشك‌و ترپە ترپی پێ دەبێ)** . . .

سەیرە ، ئەم فەرتەنەیە چی‌یە ، چی

رووی داوە لە جیهاندا ، کێ بڕوا دەکا خواکان بۆ ڕاو دەرچن .

**دەنگی سێ** :چۆن گوێ بگرە ، دەبوایە ئەم کەلینەت پڕ کردایەوە . . . خودایە . . ئەو مریشکە بە نەعلەتە بووەستێنە دەڵێی هەڵۆیە مەیەلە بە سەر سەر بانی پووشەکەدا بفرێ .

**دەنگی جۆن** :ئێ چی بکەم دەستم نایە سەری ، لە ژێر دەستم پرتەی کردو فڕی .

**دەنگی سێ** :لە باخچەکەدایە بۆ خۆی بەو پەری شادی‌یەوە دەگەڕێ . . جۆن دوای کەوە . . دەشتێکی پانو بەرینی لە پێشە . . . دەترسم دەرباز بێ .

**ڕێبوارەکە** :ئەوە خۆ بانگی کرد (سێ) . . . سەیرە ، گوایە ئەم شوێنەی کە ئیستا منی تیادام ماڵی **(سێ کونیلی)یە؟** ئەگەر وابێ ئەوا بەدبەختی منە . . دەرچوونم لەم ماڵە گەڵێ گرانترە لە هاتنە ژوورەوەم . . . زۆرم دەربارەی ئەم ژنە بیستووە ، پیسکەو بەدخووە ، تەنانەت مشك‌و کێچەکانیش دەردی پیسکەیی‌یان چێشتووە . . بە ڕاستی ئەم هاتنەی من بۆ ئێرە ڕێکەوتێکی خەفەت هێنە . لەم ماڵەوە تا ئەو شوێنەی مەبەستمە نە کوێرە دێ‌یەکی لێ‌یە ، نە ماڵێك نە وێستگەیەك . مەسافەیەکی دوورو هیچیشم پێ نی‌یە لەم گەشتە درێژەدا فریای وورگمی بخەم .

(گیرفانم هیچی تیا نیە**«گیرفانی بەتاڵ دەکاتە سەر مێزەکە»**

ئەو پایەکەمە ئەویش بەتاڵە ، تووتنیش نی‌یە پی‌ی پڕکەم ، ئەمەش دەستە سرەکەمە کە لە ئاهەنگی نان خواردنی شێودا بە دەستەم کەوت کە بە بۆنەی تاج لەسەر نانەوە سازکرا . ئەمە کێردەکەمە کە جگە لە مشتکەکەی هیچی لێ نەماوە . . ئەمەش لەتێ نانە ، لەپاشماوەی دوا ژەمی نان خواردنمەوە کە بەدەستم کەوت هەڵم گرتووە . . هەموو سامانی جیهانم ئەمەیە ، ئەم بەردە بچکۆلەیەشم پی‌یە کە لە ڕێگا هەڵم گرت بۆ ئەوەی لە سەگەوەر خۆمی پێ بپارێزم ،**(یاری بە بەردەکە دەکا)** . . . جاران بەئاسانی خواردنم وە دەست دەهێنا ، گەلێ دۆست‌و برادەرم دەناسی ، پیاو ، ئافرەتی بە ساڵاچوو ، کچی گەنج‌و جوانو . ئی‌ی هەموویان ڕۆیشتن . . . ڕۆیشتن . .

**(جارێکی دیکە دەنگە دەنگ‌و هاواری مریشکەکە دەبیسێ)**

**دەنگی سێ** :جۆن بیگرە ، بە دەوری دەوەنەکەدا دەخولێتەوە . . تۆڕەکە بە کاربێنە . . دوو دڵ مەبە . . مەترسێ . .

**(گوێ‌ی لی‌یە دەنگی مریشکەکە دەتاسێ)**

**ڕێبوارەکە** :وادیارە خۆیان بۆ نان پی‌گەیاندن ئامادە دەکەن ، بێگومان ئەم ئێوارەیە کەسێك دێتە میوانییان ، ها ، کێ دەزانی ، لەوانەیە میوانەکە من بم . نازانم چۆن گێمەکە لەگەڵ خانمی ئەم ماڵەدا دەست پێ بکەم . زۆر بێ بەزەیی‌یە ، سەگ لەو میهرەبانترە ، ئەگەر پیاو چاکانیش بە پێ خاوسی لەبەر دەمیا بوەستن‌و شتێکی لێ داوا بکەن پێیان دەڵێ بڕۆن ڕۆژێکی تر وەرنەوە ، . ئیستا دەبێ بە خۆم ببەستم . . بەزمان لووسیم . . **(تەماشای بەردەکەی دەستی دەکا)**دەزانم ئەم بەردە کاری خۆی دەکا . منیش دەتوانم کەڵکی لێ وەرگرم ، بۆ ئەوەش پێویستم بە زیرەکی نی‌یە**(هەڵدەبەزێ‌و یاری بە بەردەکە دەکا)** .ئەگەر پیلانەکەم بەم شێوەیە سەری نەگرت ، جۆرێکی تر بەکار دێنم ، من دەتوانم بە زیرەکی خۆم ڕوو بە رووی هەموو جیهان بوەستم .

(گۆرانی دەڵێ)

**ئەو شۆربایەك بۆ تۆ ئەی پیر**
**ئەوە شۆربایەك بۆ تۆ**
**ئەوە قەرنابیتێك بۆ من**
**شورباکە بۆ تۆ قەرنابیتەکە بۆ من**
**گۆشتەکەش بۆ جاکی کرێکار**
**هیوادارم لێ بوویتەوە ئەی پیری ڕووت**
**هیوادارم لێ بوویتەوە ئەی پیر**
**هیوادارم لێ بوویتەوە**
**تا شوو بکەم بە جاکی بە هێزی هەژاری کرێکار**
**تا شوو بکەم بە جاك**
**تاشوو بکەم**

**دەنگی جۆن** :(لەدەرەوە) . . دەی بیهێنە ژوورێ ، بیهێنە سێ ، وەخت نەما ، درەنگە دەبێ شێو بۆ قەشەکە ئامادە بکەین .

**دەنگی سێ** :نا توانی دەقیقەیەك چاوەڕوان بی؟

**(جۆن دێتە ژووری)**

جۆن :**(کوت‌و پڕ ڕێبوارەکەی دەکەوێتە بەر چاو)** . . **نەمدەزانی کەس لەماڵەوەیە** .

**ڕێبوارەکە** :کەمێ لەمەو پێش هاتمە ئێرەوە ، ڕێگەی دوورو درێژکە شەنگی کردووم . لە بەیانی‌یەوە تامی زادم نەکردووە .

**جۆن** :بابزانم ، رەنگێ شتێکت بۆ بدۆزمەوە**(مەنجەڵو پاتیلەکان دەگەڕێ)** .بەداخەوە هیچ نیە . . . وا بزانم ئەم سەنووقە شتێکی تیایە بەر دڵت بگرێ .**(کلیلێك هەڵدەگرێ کە لەو پشتەوە لەناو ئاگردانەکەدا شاردراوەتەوە** . .

**سەنووقەکە دەکاتەوە ، بوتڵێك‌و پارچە ئێسقانی ڕانە بەرازێکی لیّ دەردێنیّ هەندیّ گۆشتی پێوەیە ، هەندێکی لیّ دەبچڕیّ)**

**سی** :(دێتە ژوورەوەو مریشکێکی سەربڕاوی بە دەستەوەیە)

**جۆن** :(کەسی دەبینیّ ، ئێسقانەکە لەسەر مێزەکە دادەنیّ)

**سی** :جۆن دوای ئەوەی ئەم هەموو وەختەت بەفیڕۆدا دەبیّ پەلە بکەم . . . نازانم تۆ بۆ مریشکە پیرەکەت لە جیاتی ئەم مریشکە نەگرت خۆ لە بەردەمتدا گڵەکەی هەڵدەکۆلی .

جۆن جا جیاوازیان چی‌یە؟!

**سی** :مریشکە پیرەکە کەڵکی نەماوەو لە هێلکەوە چووە ، نەنکی هەموو مریشکەکانانە ، پێنج ساڵە دانی دەدەم ، بەس نیە!

**جۆن** :کەواتە گۆشتەکەی وەك ئەم تەڕو پڕ نی‌یە ، بە پێویستی سەرشانی خۆمانم دەزانی کە خۆشترین خواردن پێشکەش بە میوانەکەمان بکەین .

**سی** :بۆ دەتەویّ من زیانم لیّ بکەوی؟ (پاشان کیّ پیّ‌ی ووتی کە تامی گۆشتی دوو مریشك لەسەر مێزی نان خواردن جیاوازە .

**(دەست بە ڕووت کردنەوەی مریشکەکە دەکات)**

هەر چۆنێك بێت هەندیّ خزم‌و دۆست بە هەلی دەزانن ئەرکی ئەم جۆرە ئیشەم بخەنە سەر کاتیّ یەکیّ دەمریّ . . بۆ خۆشیان بیانوومان زۆرە .

**جۆن** :توورە مەبە ، هیوادارم چەند پارچە گۆشتێکت هێشتبێتەوە تا لەگەڵ مریشکەکەدا دای بنێین .

**سی** :تکایە وازم لیّ بێنە ، من خۆم دەتوانم خوانەکە ئامادە بکەم‌و چۆنم بویّ بیسازێنم ، ڕانە بەرازێکی خویّ‌کراو لە سەنووقەکەدایە .

**(ڕێبوارەکـــەی بـــەرچـــاو دەکەویّ)** . .بەلاّم ،چی دەبینم؟ ئەوە کیّ‌یە لەویّ : `ها ، سواڵکەر . . کابرا گویّ بگرە ، تکات لیّ دەکەم ئەگەر ماوەمان بدەیّ بچیتە دەرەوە ، هیچمان نی‌یە بتدەینیّ .

**(هـــەڵدەسیّ‌و دەرگاکـــەی بـــۆ دەکاتەوە** . .دەی .

**ڕێبوارەکە** :(لیّ‌ی دێتە پێشەوە)خانمەکەم تۆ بە هەڵەدا چووی ، من نەهاتوومەتە ئێرە بۆ ئەوەی داوای شتێکتان لیّ بکەم ، بەڵکو خۆم شت دەدەم بە خەڵك ، هیچ پەلە مەکە . . هیوادارم لەم ماڵەدا بە جوانی پێشوازیمان لیّ بکەی .

**سی** :سەیرە ، بەڵاّم لە سواڵکەر دەچی . . ئەگەر وانی‌یە ئەی کارو پیشەت چی‌یەو چۆن نان پەیدا دەکەی؟

**ڕێبوارەکە** :خانمەکەم ، سواڵکەر ناتوانیّ بێتە ئەم شوێنە ڕێك‌و پێکەو هیچیش لە خانمێکی سەلاڕو سەنگینی وەك تۆ داوا ناکات ئەگەر سواڵکەر بوایەم دەچووم لە ڕێگاو بان‌و کۆڵانەکاندا لەپم لەو خەڵکە پان دەکردەوە کە تەنانەت یەکیّ لەم ڕەوشتە جوانانەی تۆیان تیا بەدی ناکریّ .

**سی** :باشە ئێستا چیت دەویّ ، ئەگەر شتێکت دەویّ بیخۆی ئەوا هیچمان نی‌یە بتدەینیّ ، چونکە چەند پیاوێکی گەورە دوای کەمێك دێنە سەردانمان‌و لێرە شێو دەکەن ، ئەوەی ئامادەم کردوە هەر بەشی وورگی ئەوانە .

**ڕێبوارەکە** :جا من داوای هیچم کردووە؟ نەخێر خانم من داوای هیچم نەکردووە من لە گۆشتی مانگاو کێکی پڕ لە مێوژو کیسە ئارد باشترم پیّ‌یە .

**سی** :چی؟!

**ڕێبوارەکە** :(لە ژێر لێوەوە) ئەم شتەی کە پێش‌کەشیان کردم کە **بەردەکە یاری دەکاو لە دەستیا وەری دەگێڕیّ) . . وابزانم پێویست ناکا لەوە زیاتر باسی بکەم** .

**سی** :بەجۆن ،تۆ لەو بڕوایە دای ناسیاوی لە هاورێکانی (سدهی)هەبیّ؟

**جۆن** :تۆ هەمیشە بیرت بۆ لای ئەوان دەچیّ ، هەر لەو کاتەوە کە وایان لە (مولی) کرد کە بەرێکەوت پارچە زێڕێکی نێژراو لە نزیك پردی (لمیرك) دا بدۆزێتەوە . . . بە هەر حاڵ بەرای من ڕێکەوت‌بوو . . . من ئێستا بەشتێکی سەیری دا نانێم . . . ئەم بەردەی ئێستا لای ئەم پیاوەیە هیچ ناگەیەنیّ .

**ڕێبوارەکە** :ئەوەی لە ڕواڵەتی ئەم بەردەدا بەدی‌ی دەکەی لە نهێنی‌و کاریگەری شاراوەیی جیاوازە .

**جۆن** :جا دەتوانی چی بکا؟!

**ڕێبوارەکە** :زۆر شت . . . دەتوانم باشترین‌و خۆشترین ژەمی نان خواردنی بۆ خۆم ، پیّ دروست بکەم . ئێستا لە پێش چاوتاندا تاقی دەکەمەوە .

**سی** :چەند حەز دەکەم بەردێکم دەست کەویّ ئەم جۆرە شتەم بۆ بکا .

**ڕێبوارەکە** : جگە لە من هیچ کەسێك لە جیهاندا بەردێکی وا تەلیسماویی نیە ، هیچ شتێك نیە لەم جیهانەدا بەم کردارە سەیرە هەڵسیّ خانمەکەم ئەوەی ئێستا لێم دەوی‌ی ئەوەیە مەنجەڵێکم بۆ بێنی‌و کەمیّ ئاوی کوڵاویشی تێکەی .

**سی** : بە سەر چاو . . جۆن ، تکایە ئەو مەنجەلە پڕکە لە ئاوی کوڵاو .

**جۆن** : (بەگۆزەیەك هەندێ ئاوی کوڵاو دەکاتە مەنجەڵەکە)

**ڕێبوارەکە** : (بەردەکە دەخاتە مەنجەڵەکەوە) ئێستا دەمەوێ ئەم مەنجەڵە بخەمە سەر ئاگردانەکە تا بکوڵێ، نەختێکی کە خۆشترین شۆربام لە بەردەمدا دەبێ.

**سی** : سەیرە، باشە کاکە ئەوەی خستتە مەنجەڵەکەوە بەسە بۆ ئەوەی شۆرباکەی پێ دروست بێ؟!

**ڕێبوارەکە** : بەڵێ : هیچی کەی ناوێ.. بەڵام ڕەنگێ پێویستم بە هەندێ گژو گیا بێ تا خەست تری کاتەوە، تۆزێ (سلانس) تان لە ماڵا هەیە کە بە کێردێکی مشتێك ڕەش برا بێ.

**سی** : سلانس؟! نەخێر، شتی وامان لە ماڵانی یە.

**ڕێبوارەکە** : یاخود کەمێ ڕووەکی (فیرڤان) کە لە کاتی بای شەماڵا چنرا بێ؟

**سی** : فیراڤان؟! ئەمە شتمان نی یە.

**ڕێبوارەکە** : یان لقی دار گوڵی بەهار کە سەرداری ڕووەکەکانە؟

**جۆن** : ئەوەتا لە دەرەوە لەلای پەرژینەکە زۆرە، وا دەچم هەندێکت بۆ دێنم.

**ڕێبوارەکە** : نەخێر، خۆت ماندوو مەکە، لە جیاتی ئەوە نەختێ لەم گەڵا کەلەرمەی تێ فڕێ دەدەم (دوو گەڵا کەلەرمو هەندێ پیاز هەڵدەگرێو فڕێی دەداتە مەنجەڵەکەوە).

**سی** : ئەم بەردەت لە کوێ دەستکەوت؟

**ڕێبوارەکە** : باشە، بەم جۆرە دەستم کەوت، سەگێکی ڕاوکەرم هەبوو، جارێکیان، لە دەشت لە گەڵما بوو، دوای شوێن پێی کەروێشکە کێوی یەك کەوتبو. منیش دوای ئەو کەوتم، تا گەیاندمی یە لێواری چاڵێك پری لە ووردە بەرد بوو. لەو شوێنەدا دارێکی بچکۆلەی درك داری زرۆك شین دەبوو.. سەگەکەم لەوێدا وەستاو جەستەی کەوتە لەرزین، کابرایەکی گوڵەی پیر لە پێشیا دانیشتبوو، پاڵتۆیەکی تووکنی پێچا بووە خۆیەوە، (تەماشای ئێسقانی ڕانە بەرازەکە دەکا) وابزانم ئەم ئێسقانە یارمەتیم دەدا شۆرباکەی پێ تێك بدەم (ئێسقانەکە هەڵدەگرێو دەیخاتە مەنجەڵەکەوە).

**جۆن** : خودایە : ئێسقانی ڕانە بەرازەکە.. خۆ..

**سی** : (قسەکەی پێ دەبڕێ) جۆن زمانت بگرە.

**ڕێبوارەکە** : (بە ئێسقانەکە شۆرباکە تێك دەدات).. باشە..

پێم ووتن کە کابرا لەوێدا لە پێش سەگەکەمدا دانیشتبوو، ئەو کابرا پیرە، تەماشیم دەکرد. هەندێ جار بە قەد گوێزێك دەهاتە پێش چاووم، نەختێکی پێ چوو ئەوەندە زل هاتە بەر چاووم سەری لە ئەستێرەکان دەسووی، وەخت بوو بتۆقم.

**سی** : ناهەقت نەبووە.. ئێ دوایی.

**ڕێبوارەکە** : بەردێکی بچووکی دەرهێنا، ئەم بەردەی کە ئێستا پێمە.. لە گیرفانی پاڵتۆکەی دەری هێناو داوای لێ کردم باش تێی ڕوانم، ئینجا گوتی : «داوا لە سەگەکەت بکە با دوورەوە کەوێ ئینجا ئەم بەردەت دەدەمێ کە شتی سەیرو سەمەرە دەکات، دەتوانی بیخەیتە مەنجەڵێك ئاوی کوڵاوەوەو تیایدا گری دەی بۆ ئەوەی ئارەزووت لەهەر خواردنێکی خۆش بێت بۆتی بکا» نەختێکی کە ئەمەت بۆ دەسەلمێنم.

**سی** : بزانە چی لێ هاتووە.. **(سەری دادەنوێنێ وتەماشای مەنجەڵەکە دەکا)** ئاخۆ ئێستا شۆرباکە چی لێ هاتووە؟

**ڕێبوارەکە : نا، نا، دەترسم بەدبەخت بی، پەلەکردن هیچمان بۆ ناکا. پێویستە سەری مەنجەڵەکە داپۆشم ئەڵبەتە دەبێ ڕەنگی ئاوەکەی ناویشی بگۆڕم. توخوا چنگێ ئاردم لەو کیسەیە نادەیتێ؟**

**سی** : (لە لەگەنێکدا هەندێ ئاردی دەداتێ)

**ڕێبوارەکە** : (ئاردەکە دەڕێژێتە مەنجەڵەکەوە)

**جۆن** : (بەماناوە)... پیاوێکی بەهرەدارە

**سی** : زۆر بەختەوەرو ئاسوودە دەبم ئەگەر بەردێکی وا سەیرم هەبێ.

**(لە پاك کردنەوەی مریشکەکە دەبێتەوە)**

**ڕێبوارەکە** : خانم، شتێکی دیکەش هەیە دەبێ پێتی بڵێم.

**سی** : چی یە؟

**ڕێبوارەکە** : ئەگەر ڕۆژانی هەینی ئەم بەردە فڕێ بدەیتە مەنجەڵێکەوە، پڕی لە گۆشتی ئێرلەندی بێ دەیکاتە گۆشتێکی ڕەشی تۆخ

**سی** : ئێجگار سەیرە، ئەمە بە (تۆم)ی قەشە ڕادەگەیەنم.

**ڕێبوارەکە** : بەڵام لە ڕۆژانی تری هەفتەدا ئەگەر بەردەکە لەگەڵ هەر جۆرە گۆشتێکی تردا دابنێی ئەوا نە تامی دەگۆڕێ نە ڕەنگی.

**سی** : بە ڕاستی؟!

**ڕێبوارەکە** : بەڵگەش بۆ قسەکەم ئەمەیە کە ئێستا لە پێشتدا دەیکەم..

بۆ نموونە ئەو مریشکەی دەستت، ئێستا دەیخەمە مەنجەڵەکەوە تۆش بە چاوی

خۆت دەبینی دوای چەند دەقیقەیەك چی
لێ دێ . . تەماشا کە .
**(مریشکەکە هەڵدەگرێو دەیخاتە مەنجەلەکەوە)**
**جۆن** : کردارێکی جوانە . . لە رۆژێکی وەك ئەمرۆدا زۆر جوانە .
**سبی** : (بە نارەزایی‌یەوە) . . جۆن دەبێ خۆت بگرێو قسە نەکەی . . نەکەی قسەکەی پێ ببڕی دوای ئەکێشم بە سەرتا .
**جۆن** : بمبەخشە ، بەردەوامبە ، ئیتر هیچ قسە ناکەم .
**سبی** : (هەڵدەستێ) کاکە ئێستا با مریشکەکە لە مەنجەلەکە .
**ڕێبوارەکە** : نەخێر خانم ، دەبێ خۆم یارمەتیت دەم ، بەم کارەت ئازار بە دەستی خۆت دەگەیەنی ، تۆزێکی کە مریشکەکەت بە سپێتی پیشان دەدەم ، وەك پێستی خۆت سپی . . خانم نابێ دوو گوڵ لە مەنجەڵێکدا بکەونە زۆران .
**سبی** : سوپاس بۆ تۆ .
**ڕێبوارەکە** : پەلەمەکە ئەی ئەو خانمەی کە جوانی‌یەکەت چەندها گەنجی خستۆتە سەماو گۆرانی .
**سبی** : بە ڕاستی ؟ !
**ڕێبوارەکە** : بێ گومان .
**سبی** : چۆن ؟
**ڕێبوارەکە** : گوێ لەم برگەیە بگرە :
پستن . . پستنی فەنلەندی . . تاقە هیواکەم . دڵم پێشکەشت بێ ، دەبمکە بەئێسك و پێست .
**سبی** : بۆ پێم دەڵێت پیستن ؟ !
**ڕێبوارەکە** : دەتەوێ وات پێ نەڵێن ، حەز دەکەی ناوە ڕاستەقینەکەت بخەنە گۆرانی‌یەوە ؟ ئەگەر وەك تۆ دەتەوێ وا بکەن ئەوا کینە لە دەروونی ئەو کەسەدا دەچێنن کە خۆشی دەوێ ، لەوانەشە گۆرانی بێژەکان بکوژێ .
**سبی** : ڕاست دەکەی کاکە ، لەوانە بوو ئەوە ڕووی بدابا .
**ڕێبوارەکە** : جارێکیان بە تەك ئەو پیاوەوە وەستابووم کە ئەم گۆرانی‌یەی دانا ، بە قەڵەمە کۆنێکی کابرایەکی دارتاش دەینوسیەوە . . فرمێسك لە چاوەکانیەوە وەك باران ڕێژنەی بەستبوو . .
**سبی** : چی‌ی نووسی ؟ !
**ڕێبوارەکە** : ستنی فەنلەندی . . تاقە هیواکەم دڵم پێشکەشت بێ بمکە بە ئێسك و پێست ، پێکێك بە کڕنۆشەوە لەگەڵ خۆشەویستەکەمدا دەخۆمەوە .
لە نێوان دوو پیپدا (لە مەیخانەدا)
ئۆرۆ ئۆرۆ
سبەی ئێوارە دەرگاکە دەشکێنم
**سبی** : زۆر جوانە . . (دەیەوێ مریشکەکە لە مەنجەلەکە دەربێنێ ڕێبوارەکەش نایەڵی .)
**ڕێبوارەکە** : چاوەڕوانی بە تاگوێت لە کۆتایی‌یەکەی بێ . **(گۆرانی دەڵی)** تەنیا بە تەنیا حەوت شەو پاڵم لێدایەوە .
لە نێوان دوو داری بجۆڵەدا لەبەر باراندا
بیرم کردەوە لە ڕێگادا فیکەیەك بۆ هیواکەم بکێشم
بێ هوودە فیکەم کێشاو ، کێشاو ، کێشا
ئۆرۆ . . ئۆرۆ . .
(ڕستەیەك دووبارە دەکاتەوە (سبی) ش لەگەڵیا دەکەوێتە گۆرانی ووتن
سبی : (بە جۆن) من دەزانم هەمیشە لە باشیش زیاترم بۆ تۆ .
**جۆن** : باشە : (لە دڵی خۆیا) ئەو ژنە بە ستەزمانەی سرکرد .
**سبی** : (بەرڕێبوارەکە) ئێستامریشکەکە لە مەنجەڵەکە دەرناهێنی ؟
**ڕێبوارەکە** : (مریشکەکە لە مەنجەڵەکە دەردەهێنێ دوای ئەوەی باش تێ‌ی دەگوشێ) .
ئەوەتا خانم . . باش سەیری کە
**(لەسەر مێزەکەی دادەنێ)**
**جۆن** : (بەتەوسەوە) ئێستا شۆرباکە چۆنە ؟
**ڕێبوارەکە** : **(بە کەوچکەکە دەیچێژێ)** . . خۆشە ، هەمیشە خۆشە . .
**سبی** : با منیش تامی کەم .
**ڕێبوارەکە** : (بە جۆن) . . پاتیلەیە شتێکم بدەرێ تۆزی شۆربای تێکەم با ئەم ئافرەتە ئاسمانی‌یە تاقکا .
**جۆن** : (کووپێکی دەداتێ) . .
**ڕێبوارەکە** : (گوویەکە لە شۆربا پڕ دەکاو دەیداتە سبی ؟
خانم تامی کە .
**سبی** : (تامی دەکا) . . تام و بۆنی خۆشە شتێکی جوانە . . من هەموو جیهان و هەر چیم هەیە دەیدەم لە پێناوی ئەوەی ئەم بەردە سەیرەم چنگ کەوێ کە هەموو ئەمانەی دووستکرد .
**ڕێبوارەکە** : خانم ئەمە بە هەموو جیهان نایەتە کڕین ، ڕلۆرد (لوتنت) قەڵای دبلنی دامێ نەمدا . ئەمە لە مێژدا بوو (هەر نەختێ) جارێ لە شۆرباکە دەخواتەوە) .
**سبی** : بە هەرچی شێوەیەك بێت دەتوانین لێ‌ی بسێنین ؟
**ڕێبوارەکە** : نەخێر ، ناتوانی ، لەم جیهانەدا کەس نیە بتوانێ ! بەڵام تەنیا شتێك هەیە کە لەوانەیە وام لێ بکا وازی لێ بێنم ئەگەر چی بە نرخیش بێ .
**سبی** : چی‌یە ؟ بڵێ چی‌یە ؟
**ڕێبوارەکە** : (ئەویش بەد بەختی خۆمە کە لە کۆڵم نابێتەوە و بەرۆکم بەرنادا ، هەر

چەند ئەکەم‌و ئەکۆشم ناتوانم مەنجەلێك لە مالاّ بۆ خۆم بپارێزم هاوسێکانم داوام لیّ دەکەن‌و لێم دەپارێنەوە . . هەر چۆنێك بێت من بۆم ناکریّ مەنجەلێك لەمالاّ بۆ خۆم بپارێزم .
**سبی** : سەیرە .
**رێبوارەکە** : لەم دوایی‌یەدا مەنجەڵێکم کڕیبوو ، دراوسێکانمان داوایان لیّ‌کردم تا چێشتی تیا لیّ بنێن بۆ میوانەکانیان . کوتێکیان تیّ‌کرد ئیتر منیش وام بە باش زانی نەیهێنمەوەو بیدەم بە خۆیان چونکە کەڵکی ئەوەی نەمابوو ئاوی تیا بکوڵێنم پێش ئەو مەنجەلەش یەکێکی دیکەم هەبوو ، شەوێکیان بە ئیشیّ دەرچووم ، خستمە ناو دەوەنەکەوە . منالاّنی گەڕەك وایان زانیبوو گەنجینەی تێدایە کەچی لە تۆکلە هێلکە زیاتر هیچیان تیا دەست نەکەوتبوو بەلاّم لەگەلّ ئەوەشا هەڵیان گرتبوو بردبوویان . ئەو مەنجەڵەکەی کەش . . (نارەزایی دەنوێنیّ) . . ئیّ‌ی . .
**(دوو سیّ هەنگاو دەڕواو ئینجا دادەنیشیّ) . .**
**سبی** : کاکە پێویست ناکا خۆ نائومێدکەی ، هەرچۆنێك بێت . دەتوانی بەردەکەم بدەیتیّ ، منیش مەنجەڵێکی جوانی بۆ دروست دەکەم . من لە پێناوی ئەو بەردەدا هەر چیت دەویّ دەیخەمە بەر دەستت .
**رێبوارەکە** : (لەبەرخۆیەوە) دەبیّ بە زووترین کات مەسەلەکە ببڕێتەوە ، هەر ئەوەندەت زانی میوانەکەیان هات (هەڵدەسیّ‌و ئینجا ڕووی دەمی لە سبی دەکا) . . بە داخەوەم . . ناتوانم . . هەرگیز ناتوانم . . دەبیّ هەر ئێستا بڕۆم ، ماوەم نی‌یە لەمە زیاتر لێرە بمێنەوە . . ئێوارەیەکی شاد .

**سبی** : تکات لیّ دەکەم ، یارمەتیم بدە .
**رێبوارەکە** : دەوەستیّ . . تەماشای دەرەوەی دەرگاکە دەکا ئینجا لە پڕ وەر ئەچەرخیّ) باشە . .
**سبی** : (دەپارێتەوە) . . تکات لیّ دەکەم .
**رێبوارەکە** : نا ئارام مەبە . . بەلاّم چی‌یە کە دەتەویّ بمدەیتیّ ؟
ئایا بای ئەم بەردە دەبیّ .
**سبیّ** : (بە سەرسامی‌یەوە) . . خودایە . .
**جۆن** : چاك وایە بەردەکەی بەلاّیەنی کەمەوە . بۆ ماوەی رۆژێك بۆ بەجیّ بێلی تا بە خۆی تاق بکاتەوە . ئینجا .
رێبوارەکە : **(قسەی پیّ دەبڕیّ)** وابزانم من جارێکی تر لێرەوە تێپەر نابم .
**جۆن** : بەلاّم .
**رێبوارەکە** : (قسەکە بە جۆن دەبڕیّ‌و ڕووی دەمی لە سبی دەکا) خانم ، تۆ مرۆڤێکی ئەوەندە باش‌و میهرەبانی‌و بە باشی لە گەڵما رەفتارت کرد . لەبەر هەموو ئەمانە فەرموو ئەوە بەردەکەو هیچیشم ناویّ ، بۆ خۆت ئاواتیّ ژیانێکی بەختەوەر بۆ دەخوازم‌و هیوادارم بە بەکارهێنانی بەختەوەر بی . . (بەردەکەی دەداتیّ)
**سبی** : (بەدڵخۆشی‌یەوە) گەورەم تۆ پیاوێکی مەزنی ، لەم ماڵە هەر چیت دەویّ ببیە .
**رێبوارەکە** : نەخێر خانم ، بەلاّم لەوانەیە هەندیّ خواردن ببەم چونکە لە رێگا پێویستم پیّ‌ی دەبیّ) شاری (تەبیر ) دوورەو تا نیوە شەو نایگەمیّ .
**سبی** : راست دەکەی .
**رێبوارەکە** : باشە . . مریشکەکە هەڵدەگریّ‌و دەیخاتە کیسەکەیەوە) . . ئێستاش هیوادارم پێت ناخۆش نەبیّ ئەگەر داوای ئەم بوتلە شەرابەت لیّ بکەم . . تۆ خۆت دەتوانی بەم بەردە زۆری لیّ دروست بکەی .
**سبی** : بەلّیّ گەورەم . .
**رێبوارەکە** : (بوتلە شەرابەکە هەڵدەگریّ‌و دەیخاتە کیسەکەیەوە)
**جۆن** : تۆ شایستەی هەموو شتێکی . . بەلّیّ هەموو شتێك چونکە پیاوێکی گەلیّ بەهرەداری .
**رێبوارەکە** : (بەرەو دەرگاکە دەڕواو دەچێتە دەرەوە)
**جۆن** : (دوای دەکەویّ بۆ دەرەوە)
**سبی** : (بەردەکە لە دەستیا وەردەگێری) . . خۆشترین مەی هەر وەکو خۆی گوتی . . هەموو خەلك دێنە سەیری ئەم شتە سەیرە ، دەولەمەند دەبم . . بەلّیّ ئەو پەری دەوڵەمەند دەبم . . (بانگ دەکا) جۆن جۆن لە کویّ‌ی ؟
**جۆن** : (دێتە ژوورەوە)
**سبی** : جۆن لە کویّ بووی . ؟
**جۆن** : رویشتم بەریّ‌ی بخەم . . بەڕاستی پیاوێکی بەهرەدارە .
**سبی** : وایە جۆن .
**جۆن** : میوانەکەمانم لە دوور چاو پیّ‌کەوت . . وا بەرەو ئێرە دیّ بۆ شێوکردن . . چاك وایە بەردەکە بخەیتە مەنجەلەکەوە . تا خواردنەکە ئامادەکەی .
**(گویّ‌ی لیّ‌یە لە دەرگاکە دەدریّ)**
جۆن خۆیەتی میوانەکەمان . . **(بە تەوسەوە)**
بەردەکە بخەرە مەنجەڵەکەوەو خواردنەکە ئامادە بکە .

**لە گۆڤاری (الاقلام)**
**ژمارە ٦ سالی ١٩٧٩**
**وەرگێراوە**

# "بیروڕای جوانکاری لەلایەن شیلەرەوە" ..



«فەردیك شیلر – ١٧٥٩ / ١٨٠٥» پێش بەرپابوونی
شۆڕشی فەرەنسی دەستی بەدانان کردووە. نووسینەکانی لە
باخی بوون دژی دەوروبەرەوە بەدەرنەبووە. شانۆگەریە
بەناوبانگەکانی (دزەکان) و (ئاژاوە نانەوەو خۆشەویستی).
لەپاشان پەخشی (بۆنخۆشی) شی هەر لە هەمانکاتدا

نووسیووەتەوە شیلەر لە نامەکانیدا بۆ برادەرانی ، نووسیبووی : ئیتر مرۆڤایەتی بریاری چوونە مەیدانی جەنگ‌و شەری ئازادیخوازی ، دژی دەنگ‌کپکردن‌و چەوساندنەوەدا . .

هەرلەسەرەتاوە ، بۆ ئەوەی ببێتە گەلێکی ئازادو سەربەخۆللە ئەبێ دەنگی سەربەست‌بوون بەرزبکاتەوەو سەرلەنزێ خۆی بژێنێتەوە . ئەم دەربرینەس لە پەخشەکانی (نموونەی بەرزو ژیان» و «خۆش‌رابواردن)ژ «سروودی زەنگدەر» بەرچاو دەکەوێت . و لە هەردوو پەخشەکانی دوایی‌دا ، هەستیار دژی شۆرشی فەرەنسی دەوەستێت . هەلبەبە ئەو کە سروشت‌و خواستی شۆرش نەگەیشتبوو بە ئاژاوەی گۆرانکاریە دژیەکانی دەزانی .

لە پەخشی یەکەمدا هەستیار بەرنامەی ژیانی – لە دەوروبەر راپەرین‌و مانەوە لەژێر کارتێکردنی فەلسەفەی کانت‌و تیوورە جوانکاریەکان‌و گەران بە شوێن رزگاربوون لە جیهانی نموونەی بەرزدا – دیارکردووە . وە «ئینجلز» ئەم هەلوێستە نوێیەی شیلەر ، بە دوورگرو هەلاتن لە ناخۆشی ئاکۆزتر دادەنێت‌و ئەم هەلوێستەشە لە ژمارەیێ سرودی پر لە بێزاری‌و بێ‌ئاوات‌دا ، کە باسەکانی سەربەچەرخی ناوەراستن ، رەنگ دەداتەوەو لە سالی «١٧٩٩» داکارە شیلەر گۆرانی پوختەیان بەخۆوە بینی . لە زنجیرە شانوگەرییەکانیدا (فالنشتاین)و (جان‌داذك) و (فلهلم‌تیل)دا ، باسی خەبات‌و خۆبەخت‌کردنێناو سەربەستی‌دا دەکات . . شاعیر وابەرچاو دەکەوێت کەوا بەشێوەیێکی ناراستەو خۆخۆ لەگەل پێشرەوی شۆرشگێری ، کە ئەو سەردەم گەلی ئەلمان هەیانبوو ، لێکدەدامەوەو دەگونجێت .

هەروەك روونە ، شیعرەکانی شیلەر ، سیمای واقیعەتی رەبەق‌هەلدەگرن . وەشاعیر ، هیچ‌کات خۆی لە توانای خەلك‌بنین‌و راستی پیشاندانی ژیان‌و بەهاوارچوونی سەربەستی دووره پەرێز نەگرتووە . لەمەش زیاتر ، دانانی پالەوانەکان لەگەل خواستی گشتی‌دا زۆر رێکە . ئەم مەسەلەیەش «ئینجلیز» و «مارکس» و «جیتە» سەرنجیان بۆ راکێشاوە . هەتا ئەوەبوو ، جارێك (جیتە) دەستی بۆ ئەوە درێژکردبوو ، کەوا بۆ چوونی شیلەر نە ئەم مرۆڤەو نە بۆ ئەو مرۆڤ و ئەو شتانەیە ، بەلکو بیروباوەرە . وە ئاشکرایە کە جیبە تیوورەکانی (کانت)ی ، نەك تەنیا بە دل نەبووە ، بەلکو رووبە رووشیان دەوەست . جا سەرەرای دۆستایەتی بەتینی نێوان هەردوو شاعیر ، دەبینین ، جیتە لەگشت نامەکانی‌دا بۆ شیلەر ، ئەم بەرەنگاریە هەیە .

شیلەر لە سالی ١٧٩٥ دا ، بیرورا جوانکاریەکانی لە کتێبەکەیدا «نامە لەمەر پەروەردەی جوانکاریەوە» دا دارشت . وە لە سالانی ١٧٨١ – ١٧٩٠ دا نووسینەکانی لەمەر شیکردنەوەی ئەرك‌و گرنگەکانی شانۆوە بوو . لەسالی «١٧٨٢» یشەوە لەکتێبەکەیدا «شانۆ وەك دەزگایەکی نەتەوایەتی» ، بیروراى پێشووی ، بەووردترەوە ، دارشتەوەو لە ئەرکەکانی شۆرشگێری هونەر دوواوە .

رەنگدانەوەی دەوروبەر لەهونەردا ، بەپێی بۆ چوونی نێوبراودا مەرجی جوانیە ، گەر لاچوو بێ‌نرخ دێتە بەرچاو . لە سالی ١٧٨٨ دا ، وەلەیەکێك لە نامەکانیدا ، شتێکی لەمەر پەیوەندی نێوان ئەم دوو بیرەدا خستەرزو . وە کتێبەکەی «نامەدەریارەی دون‌کارلوس» پرە لە یاخی بوونی شۆرشگێری دژی دەوروبەر . وە هەمیشە بۆ باوەری خولقاندنی داستانێکی مەزن کە تەواوی ژیانی نەتەوایەتە بگرێتەوە ، دەگەرایەوە . هەندێ لێکۆلەر ، وا سەرچاوەکانی ئەم بیرەی شیلەر دەبینن کەوا لە تیوورەکانی جوانکاری‌ی ئینگلزیەوە ، لە چەرخی رۆشن‌دا ، هەلقولاوە . وا دەست نیشانی هەولەکانی ئەو ، لەمەر بەستنەوەی مەسەلەی هونەر بە مەسەلەی رەوشت لله دەکەن . وە شیلەر هەردەم مەسەلەی پەروەردەکردنە ، بەمەسەلەی بنچی هونەر دادەنا . هەروەها برگوزاذی رووبەرووبوون دژی ئاژاوەو تێکچوونی ژیامی ناوخۆ ، کە دەگەرێتەوە بۆ پەیوەندیەکانی رژێمی نوێی بورژوازی ، لەسیمات‌و نەریتی چەرخی روشن دابوو . هەندێکی‌تر وایان دەبینی کە نەریتی ئینگلیزی «لێکۆلینەوە لە گێژاوەی جوانکاری» ، شیلەری بۆ «ئیستیتیکای کانت » پالداوە . هەرچۆنێك بێت ، رای شیلەر لە بیروراکانی شۆرشگێریەوە بۆ باوەری «کانت» یەوە ، هۆکەی باسی فەلسەفەی نەبوو .

جا لێرەدا ئەو رایە دێتە گۆ ێ ، کە هۆیەکەی : رووداوەکانی سیاسی فەرەنسا بووبێت . شیلەر بە ئاشکرا لەمەوە دەوێت ، لەو کاتەی کە هونەر بە «کچی سەربەستی» دادەنێت ، کە گۆرانکاری شۆرشگێری دژوار هەلناگرێت ، نجگە لە جیهان دەرچوون نەبێت ، هیچ لەبەردەم سەربەسبیدا نامێنێتەوە . لە «لودفیك فیرباخ» دا ئینجلز اەنووسێ : شیلەر باوەری بە «نموونەی کانت»ەوە هێناوە ، کە پوختەکەی «یاخی بوونێکی بچووکی توانانەداری بۆرژوازی‌ی دژی دەوروبەر »ی بینییوە . هەلبەتە جیاوازێکی گرنگ لەنێوان‌شیلەرو کانتی ماموستایدا هەیە .

لە نامەکامیدا ، لە کۆتایی سەدەی هەژدەمەوەو ، شیلەر

رەخنەی لە بیروراکانی «کانت »ەوە دەگرێت ، چونکە بیرگوازی «ئائقلانّە بە شێوەیێکی خودییەوە» یەو شێوەی جوانکاری بە دیتنەی – شێوەیی– تەسك دەکاتەوە . وە لە رووی ناوەرۆکو لیّ زانین ، نەك رێگاکەیەوە ، کە هۆی بەرزی جوانی‌یە ، دژی شێوەی کانتی وەستا .

دیسانەوە لەمەڕ دەوری هەستکران بەزانینی جوانکاریەوە ، بەپێنچەوانەی کانت وەستاو دووپاتی کراوەو لەگەل رای کانتدا ، لەمەڕ هەردوو هەستکردنی جوانکاری‌و رەوشتیەوە ، جیابوو .

شیلەر ، زۆر بەتەنگەوە نامەکانی بۆ پاڵدانی کەسی‌ی اژی واقیعی ئەوسای کۆمەلاّیەتی دەنووسی‌و رەخنەیێکی توندو تیژی ئاراستەی رژێمی سیاسی ئەڵەمانی دەکرد . هەرەشەی دەبردە سەر لایەنی دەستدارو زوڵمو زورداری‌ی دەوڵەت ، کە رۆشنبیری رەخنکاندو خەڵکی بۆ کاری میکانیکیەوە پاڵ دەدا .

رای شیلەر لەمەڕ بەرپاکردنی شۆرشێکی جوانکاریەوە ، کە خەڵك بەگیانی شۆرشی سیاسی ئایندەوە پەروەردە دەکات ، تووشی بەرەنگاربوون هات ، لەمانە گوایە وەستانی شیلەر دژی دەوروبەر ، لەراستیدا شتێکی بیّ‌هیچو شێوەیی‌یەو ئاواتە جوانکاریەکانیشی بەرەو بیرگوزاری ئزنەیی رااەکێشێت . بەلاّم وێستی شیلەر ، لە کەسەوە بۆ چێشکەوتنێکی دروست ، لەبیذ گشتیان چووبوو .

شیلەر ، لەپێشەکی «نامەکانیدا» ، دەنووسیّ . . . ، لەسەر هونەرە ، بۆ ئەوەی بتوانیّ بوەستیّو لە پێداویستیەکانی سەرزەمیندا بەرزتربێتەوە ، دەوروبەرو واقیع بخاتە ئەزکاوە هونەر کوری ئازادیەوە ئاواتی ئەوەیە کە رێگای بە یاسای گیانی – روحی – نەخش کرابیّ . کەواتە ، ئەرکو گرنگی‌ی هونەر ، لەلایەن شیلەرەوە ، رزگارکردنی مرۆڤە . وەمرۆڤ دەتوانیّ رێكوپێکی ناوخۆیی وەدی بهێنیّ گەر دوور لە واقیعی دەوروبەردا وەستا . جا لێرەدا بیانۆکانی شیلەر ، کە پشت بە باوەری کانتەوە دەبەستیّ ، بەرچاو دەکەوێت ، نامەی هەژدەهەمی بەم جورە دەست پیّ دەکات : «جوانکاری ، وا لە مرۆڤی هەستدار دەکات بەرەو شێوەو بیرکردنەوە بچێت ، بەلاّم مرۆڤی – روحی ) بۆ مادیەب دەگێرێتەوەو جوانکاریش بۆ جیهانی هەستکردنەوە دەبات» . بەگوێرەی رای شیلەرەوە لە پەبر ەوی سروشتی کە بە ماددە« یان « هەستدار » ناو دەبات ، ژیانەکە خۆیەتی . بەلاّم پەیرەوی رەوشتە کە زۆرجار بە «شێوە» ناوی دەبات ، گیانەو لە ئیرادەو ئەقڵەوەیە . وەسپانی پەیرەوی

سروشتی پالدەری هەستی‌یەو هە رەوشتیش ، پاڵدەری رێکخراوی ماددەیە ، پاڵدانی هەستداریش سەرشۆرە بۆ سروشب ، بەلاّم رێچکەی جوانی ، هەروەك لای کانت‌دا . حاڵەتی ناراستەوخۆیە . وە مرۆڤ لەوکاتەی بە ئاوانی شتێك دەبێت ، لە سروشت جیادەبێتەوە کە ، سەرەرای ئەوەی سەرااری نەە ، بەلاّم بەوەش دەوەستیّ مەبێتە ژێردەستی (–هەردوو نامەی بیست‌و چوارەم‌و بیست‌و پێنچەم) . شێوە . لەحاڵەتی گێژاوەی جوانکاری‌دا ، بە ماددەوە دەنووسێت ، کە بەستنەوەی ئازادی گیانی‌یە بە ژیانەکە خوی «نامەکانی : یانزەو دوانزەو سێنزەهەم» . وە ئەو پاڵدانەن لەگەل پەیرەوی جوانکاریەوە دەگونجێت ، پاکدانە بۆگوزەذانی‌و کەرەسەکەشی شێوەی زیندوویی ئوانکاریە «نامەی پانزەهەم» . دیسانەوە شیلەر رست بۆچوونی خۆش‌گوزەرانەش ، لەرووی بنجی‌یەوە شی دەکاتەوە « نامەی بیست‌و شەشەم» ، هەروەها لەرووی ئەرکیشەوە ، لەبواری هەست‌پێکردن‌و تاقیکردنەوەی جوانکاریەوە شی‌دەکاتەوە ، دەڵیّ : ئێمە ، لە بواری خۆش‌گوزەرانیەوە ، هەڵس‌و کەوت بە رێگای گونجاو لەگەل دەوروبەردا ناکەین ! ئێمە وەك شێوە بۆی دەچین ، وە بۆ پنجانندنی رابواردنی دڵشادی کاتی‌یەوە ، دوور لە ئەرکی پەیاس‌و کارداریەوە ی ژیان . وەگشت گێژلوەی جوانکاریت لە لایەن شیلەرەوە ، بۆ رابواردن‌و خۆخەریك‌کردنە . مرۆڤ لەوکاتەی هەستی ماددی بە شێوەی گیانی‌ی ،وە رووداوەکانی بە هەستی سەربەستیەوە دەبەستێتەوە ، لە گێژاوەی جوانکاریدا ، دەبێتە کەسێکی تەواو پێشکەوتوو . وە ئەم تیوورەش «تیووری هونەر وەك خۆش‌گوزەران‌و خەریك‌بوون‌و شێوەی دەرەوە» دەنگی نارەزایی لەتەلی باریکی رای واقیعیەکاندا بەرزکراوەوە . هونەرمەند لە «نامەی بیست‌و شەشەم » یدا ، بەردەوام مەسەلەی شێوە شی دەکاتەوەو وادەبینیّ کە زیاتر لەوەە هەبوون‌و راستی بێت ، جوانکاری‌یە شێوەلە چالاکیەکاندا ، گەرپێویست بە واقیع بوو ، مانای داردەستی مەبەستەکانی ماددی نادات بەدەستەوەو هیچهش نیە بەرامبەر بە ژهانی گیانی – روحی – یەوە . گرنك ئەوەیە ، حوکمدانمان بەسەر شێوە ، بە چاوی تەماشاکردنی دەوروبەرەکەوە ، وەربگرێت . جوانی‌ی زیندوویی مێنە ، هەروەك جوانی‌کراوی (لەهونەر) دا لامان دڵگیرە ، بەلاّم ئەوەە لە جوانی‌ی زیندوویدا لامان لە جوامی‌ی وێنەکراودا پەسەنترە ، ئەوە هۆکەی شێوەکە خوێتی .

جا بەم جورە ، دەوروبەر ، وەك رایەك ، ئەبیٚ ئەمە هوی بەدلّ بوون بیّت .

هەمان بیروڕای نێوبراومان ، لە شیکردنەوەی هونەری شانۆدا ، بەرچاو اەکەوێت . لە کتێبەکەیدا «لەمەڕ تراژیدیازە – ۱۷۹۲» بە دوورو درێژی باس لە زیندوویّتە دەمەتەقەو ووردی فرمانو ڕاستی کەسەکانو هەستو نەست دەکات ، بەلاّم لەپاسان دەلێ : ئەم ڕاستیانە ئەبیّ وەك ڕاستی هۆنراوەیی‌و دەروونی ، بیّ‌ئەوەی بە واقیعی مێژووەوە ببیەسترێنەوە ، زەربەیرێن . شاعیری تراجیدیا ، وەك هەستیاذانی برەوە ، هەر تەنیا بۆ یاسایی ڕاستی هۆنراوەوە سەرشوڕەو بەس .

شایانی باسیشە ئەوە بلێین ، کە لەسەرەتاوە ، بیروباوەڕەکانی کانت لای شیلەرەوە لاپەڕێزبوو ، بەلاّم لەدواییدا ، بوو بە کەرەسەی سەرەکی‌و بنجە لێکۆلینەوەی بەرفرەی زانستی جوانکاریەوە .

لێکۆلەرەکان ، بەشێکی زۆری تیوورەکانی شیلەر ، لەمەڕ سەرهەلّدانی هومەرەوە ، بەڕاست دادەنێن . وە لەمەڕ پەیدابوومی «هزنەر لە خۆش‌پەرستی‌و خۆخەریك‌کردنەوە شەوە ، ڕەنگە دارشتنێکی ئالۆز ، لەمەڕ پەیوەندی هونەر بە ژیانەوە یان هەولّدانێك بۆ دەرچوون لە هەلّوێستی ئاواتداری کانت ، بەرچنگمان بکەوێت . ئەمینێتەوە ئەوە بلّێن ، کە ئەم سەرنجدانانە پووختەیی نین ئەگەر تەواوی بیرگوزری ئەم بابەتەی شیلەرمان لێك‌دایەوە ، چونکە ، هەروەك ئاشکرایە ، خۆخەریك‌کردن لەکاری سەرەکی‌ی مرۆڤ ، واتە هونەر لە دەوروبەردا ، جیا دەکاتەوە .

لەڕاستیدا «شێوە»ی شیلەر لەگەل «شێوە» ی کانت یان شێوە بەپیّ‌ی بۆچوونی ئەمرۆی هاوچەرخ‌دا ، جیاوازە . ئەبیّ سەرنجی ئەوەش بدرێت کەوا شیلەر نەیووتووە تاکەکاری بەنرخ لە هونەردا ، هۆکانی دەربڕینی هونەریی‌یە . وە لە نامەی «بیستو پێنجەم»یدا ئەیەویّ ئەوە بسەلمێنیّ کە ، جوانی نەك تەنیا لە شتەکەدانیە ، بەلّکو حالّەتی هەست‌چێکذدنی خولّقهەنەرز وەرگرە ! جا ئەبم جۆرە «شێوە» ی ئەم باوەڕە بەو مەسەلەیە دەبەسترێەوە کە ، گێژاوی خزلّقێنەر یان وەرگر باهەخدارترە لە دووبارەکردنەوەی خولّقاندنی دەرورووبەردا . وە لە کۆتاییدا ، شهلەر گێژاوەی جوانکاری ، هەروەك لای کانتەوە ، لە ئەذکی پێناسین جهادەکاتەوە . بەلاّم لەمەڕ ئەرکی ڕەوشتەوە ، لەگەل کانت‌دا یەك ناگرێتەوە . شیلەر سەبارەت بە ئەرکی ڕەوشتەوە ، زور جار دووپات دەکاتەوە کەوا بوونی خودی جوانکاری ، بەرەوشتەوە دەگۆریّ ، سەرەڕای ئەوەی کە لە دواییدا نەگەیشتە هیچ ڕاستیێك دەربارەی ئەوەی کە کارە هونەری لەو کاتەی لە واقیعدا ڕەنگ دەداتەوە ، لە هەمان کاتیشدا برهتی‌یە لە یاسای دەروبەری ڕەوشتدا . بەلاّم ناوبراز ، بڕوای بەوە هەیە کە پەروەردەکردنی جوانکاری ، لایەنی ڕەوشت لەلایەن مرۆڤەوە ، قولو بەتینتر دەکات .

لە یەکێك لە نامەکانیدا بۆ جیتە ، دەلیّ :
شاعیرو هونەرمەند دوو ئەرکی هاوتا هەلّدەگرن : سەرااری بەسەر واقیعو مانەوە کە سنوری هەستداذین . جا ئەگەر ئەم دوو ئەرکە بەجیّ‌گەیندران ، ئەوە کاری هونەری دێتە کایەوە . بەلاّم هونەرمەند ، واقیع لە سروشتی ناگونجاو نارێك گوم دەکات ، بەتایبەتی گەر لە رووی بیرەوە کزو بیّ‌تواناییّت ، یان هەر لە سنووری هەستداری‌یەوە دەمێنێتەوە .

ئەوەی شیلەر دەلی ، دوو لێکدانەوە هەلّدەگرێت : یان دژی سروشتیەت Naturalism دەوەستیّ ، یان گومان لە ئەرکی پێناسین کاری هونەری «جورج لوکاش»دەکات .

شیلەر ، هەر لە سالّی «۱۷۹٦»ەوە ، لە جوانکاری نموونەکەییەوە دوورکەوتەوە ، بۆ وێنە لە لێکۆلێنەوەکەیدا لە سالاّنی ۱۷۹٥ ، ۱۷۹٦ لەمەڕ «هۆنراوەی ساکارو بەسۆز»دا ، نرخی ناوەڕۆك لە کاری هونەریدا بە چاك دەزانیّ‌و نرخی دەداتیّ‌و دان بە پێویستی لێکۆلینەوەی دوورو درێژی سروشتەوە دادەنێت .

دیسانەوە لە بیرگوزاری جوانکاری «فنکان»ەوە دوور دەکەوتەوە ، چونکە بەربەسك‌بوو . جا بەم جورە ، شیلەر پێشنیار دەکات کەوا بیری ڕاستی شوێنی بیری جوانکاری بگرێتەوەو چاو لە بوارەکانی بۆچوونو زانینو تاقیکردنەوەو دیاردەی دەوروبەریش نەپۆشرێت . لە لێکۆلینەوەی نێوبراویدا ، باس لەوە دەکات کە هونەرمەندی ساکار وەك مندال وایەو ڕاستەوخۆ بە سروشتەوە دەنووسێت سەرەنجام جیاوازی نێوان خودی خۆی‌و سروشت ناکات ، وەگونجانی ناوەکی «لە نێوان هەستو ئەندیشەو ئەقلّ» داو ، دەرەکی « پەیوەندیەکانی لەگەل خەلەك‌و شتەکان» ، هەمیشە شێلو نابێت .

بەلاّم هونەری سۆزداز ، چەیوەمدی لەگەل سرزشتدا گوم دەکاتو لیّ‌ی دەگەڕیّ‌و وازی لیّ‌دەهێنێت ، کەچی هونەرمەندی ساکار بەشێکیەتی‌و هەلّبەتیشە لە کارەکانیشی‌دا . وهونەرمەندی بەسۆز ، پێش هەموو شتێك لە کارەکانی هونەرییدا ، باسی خوی دەکاتو لەگەل گشت جۆرە

دیاردەیەکیش دەگونجێت . هیچ کات هەست بە گرنجامە نازەکی و دەرەکی ناکات وهەروەك وێنەی دەوروبەرە فیعلیدا ، ئەو نموومەیەی لە وێمەی هونەریدا دەخولقێنرێت ، دەشێوێنێت . جالەبەر ئەوەزە ، بیری گێڕانەوە بۆ سروشت ، نەك سروشتەکە خۆی ، بەسەرکارەکانی هونەرمەنددا زاڵبوو . دیسانەوە ، زوربەی زوڤە خەڵك کە هونەرمەندی ساکار دەگەنو بۆی دەبزوێن ، کەچی ئەم هەستجوکاندنە بۆ هونەرمەندی سۆزدار کەمە .

ئەوەی راستبێ ، شیلەر ، وەك باسێ سەرەکی بۆ لێکۆڵینەوەکانی لەمەسەلەی هونەردا . هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەم شیکردنەوانەی لەمەڕ هونەرمەندی ساکارز بەسۆزدا دەکرد ! بەوێنە ، هونەری «ئەنتیك»ی بە ساکار «بەواتای واقیعی» و هاوچەرخیشی بە سۆزدار «بەواتای نموونەیی» دادەنا . بەرای ئەو ، هونەری راستەقینە ئەبێ ساکار بێت . وەزۆرکردن لەواقیعدا ، وا لەم هونەرە دەکات سیماتی دیاریکراو هەڵبگرێت و لەو ئەنتیکەی شیلەر بە نموونەیی دادەنێت ، دووربکەوێتەوە . جا بەرای لوکاش ، شیار لە روونکردنەوەی ئەم مەسەلەیەدا سەرکەوتوو نەبووە ، واتە نەیتوانیووە سەرچاوەکانی کۆمەلایەتی سیماتی هونەری سەردەمیدا ، بە چاکی دیاری بکات . جا ئەوەی راستی بلێ ، سەرەرای ئەوەی لێرەدا لەمەڕیەوە ووتراوە ، شیلەر ، هەروەك «هیگل» لە کتێبەکەیدا «دیاردەی گیانی» مەسەلەیەکی مێژوویی سەرەکی دۆزیەوە ، ئەویش وەرگرتنی هەڵوێستێکی گورج و بەهێز بەرامبەر بە دەوروبەرو خولقاندنی پاڵەوانی سەرکەوتووە لە ئەدەبی هاوچەرخدا . گومانیش لەوەناکرێت کە ئەم مەسەلەیە سەری شیلەری بۆ ماوەیەکی درێژ قاڵ نەکردووە . ئەوەی ئاشکرایە ، شیلەر بە شێوەیێکی راستەوخۆ واقیعەتی وەرنەگەگرتووە ، چونکە هەر لەپێشووەوە چەند یاسایێك بەسەر هونەردا دەسەپێنن .

جا ئەگەر مەسەلەکە بەندبێ بە هونەری تەشکیلی ، شیلەر بایەخێکی ئەوەندەی پێنەداوە . جا ئەگەر چەند سەرنجێکیش لەم بارەیەوە هەبێ ، ئەبێ دەچێتە ژێر باسی پێشکەوتووی گشتی بیرورا جوانکاریەکانی . لەساڵی «١٧٨٥»ەوە ، لەمەڕ هونەری ئەغریقیەوە – کە هۆیەك بوو بۆ هەڵچوونی ، لەوەی کە مرۆڤ بەتەواوەتی راستی و جوانیی گیانیی – فیزیکی دەرناکات – نووسیبووی هونەری ئەغریقی بە ژیانی ئەوسای ئەوانەوە دووپات دەکاتەوە . ئەوان ، بەسەروسیماو شێوەکانیانەوە ، لە خوداوەند نزیکن و خێزانێکیان پێکدەهێنا . جا سروشت ، بەرامبەر بە یۆنانی کۆنەوە ، شتێکی نزیك و نرخدار بووە . شیلەر لە کتێبەکەیدا لەمەڕ سنووری پێویست بۆ بەکارهێنانی شێوەی جوانکاریەوە ، لەوکاتەی باسی کاری پەیکەرتاشی دەکات ، ئەم رایەی دووبارە دەکاتەوەو دوپاتی ئەوەش دەکات کەوا شارەزاو کارزانێکی باشە سەبارەت بە دیارکردنی سیماتی جۆرەکی و نموونەیە لە حاڵەتی تاکەکەسیدا . رای شیلەر لەمەڕ وێنەگرتندا . بەتەواوەتی لەو ووتارەیدا دیاردەکەوێ ، کە لە ساڵی «١٨٠٠»ەوە ، لەوکاتەی لەگەڵ جیتە لە رێکخستنی پێشبڕکەی «ڤایمار» ی هونەرییەوە هاوکاری دەکرد ، نووسیوویەوە ، سەرنجی بۆ ناوەرۆك کێشاوەو سەبارەت بە شێوەشەوە کەم پەنجەی بۆ درێژکردووە . (–ووتارەکەشی بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو باسانەبوو کە پێشکەش بە پێشبڕکەکە کرابوون –) . دەربارەی بەرهەمی سەرکەوتووی پێشبڕکەکە ، شیلەر دەنووسێ : «گشتیان رەنگدارو بەپێی بیری هونەرییەوە رێكبوون) .

هیچیان باسەکەیان لە دەوروبەری ئاساییەوە وەرنەگرتبوو . هەمووشت تەنیا رەنگی «بیر – فکر–) ەکە بوو – هەر لە پێناوی ئەویشەوە بوون–»

بەمجۆرە ، زۆر گرانە هەڵوێستی گشتی شیلەر ، بەپێی ئەم قسانەیەوە ، دیاربکرێت . کەچی هیچ گومانی تیانیە کەوا شیلەر وەك بڕوای ئەوەی هەیە کار لە دەروون بکات و بایەخ بە شتەکان واقیعی و سایکۆلۆژی کەسەکان و باس و خواسی دەوروبەر بدات . بەڵام هەڵسوکەوت ، وەك بەرهەمی بیری هونەری ، لەگەڵ وێنە دەکات .

سەبارەت رای شیلەر بە تیووری هونەرە تەشکیلیەکانیشەوە ، دیسان بەرگومان ناکەوێت کەوا رەنگدانەوەی بیروباوەڕەکانی جیتە ، کە نەیتوانیووە خۆی لە نموونەی ئەنتیکی وەك یاسایەك بۆ هێنانەوك هونەر بەگشتیەوە ، بووبێت . وە هەر لە بواری ووتنیشەوە دەڵێن ، رۆمانتیکە ئەڵەمانەکان ، کە هیچ کات شیلەر بۆیان نەدەچوو پشتیان بەراکەی ئەو بەستبوو ، کەوا کاری هونەری بەرهەمی تاکە کەسیەوو نابێ بەر کارتێکردنی دەوروبەر بکەوێت .

روشنبیری نوی

لە کۆڤاری (أفاق عربیة) ژمارە – ١ – ئەیلولی ١٩٨٠ وەرگیراوە

